له بڵاوكراوەكانی ماڵپەڕی بەهەشت

# دەعوە و بانگەوازكردن بۆ لای خوا
# و
# ڕەوشتی بانگخوازان

( الدَّعْوَةُ إِلَى اللهِ وَأَخلاقُ الدُّعَاة )

**نووسینی زانا و پێشەوا**

عبد العزيز بن عبد الله بن باز رحمه الله

**وەرگێڕانی**

**محمد عبد الرحمن لطيف**

**وتارخوێنی مزگەوتی ( شێخ إبراهيم ) / كەلار**


چاپی دووەم ١٤٣٨ ك


---


**ماڵپەری بەهەشت**

ba8.org

ماڵپەڕێكی ئیسلامی زانستی پەروەردەیی یە و لەپێناو بڵاوكردنەوەی ئەو ئیسلامەیە كە سەلەفی صاڵح - پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی (رضي الله عنهم) لەسەری بوون - وە سەر بە هیچ گروپ و لایەنێكی حیزبی نیە.

## ماڵپەری بەهەشت

**ئەو کتێب و بابەت و لێکۆڵینەوە شەرعیانە بڵاو دەکاتەوە کە دەبنە هۆی:**

١. شارەزاکردنی موسوڵمانان و پەروەردەکردنیان لەسەر رێگا ڕاستەکەی ئیسلام، ئەمەش دەستەبەر دەبێ بە گەڕانەوە بۆ پەیڕەوە رەسەنەکەی ئیسلام،کە بریتی یە لە قورئان و سوننەت،بە تێگەشتنی پێشین وپێشەوایانی ئوممەت.

٢. پاک کردنەوەی بیروباوەڕ و ڕەوشتی موسوڵمانان، لە دیاردەکانی شیرک و کوفر و تاوان.

٣. پاڵاوتن و تەصفیەکردنی ئاینی ئیسلام لە بیدعە و بۆچونە داهێنراوەکان.

٤. وریا کردنەوەی موسوڵمانان لە شوێنەواری خراپی ڕیوایەتە لاواز و هەڵبەستراوەکان.

٥. پتەو کردنی برایەتی یەکی ڕاستەقینە لەسەر بناغە فراوانە جێگیرەکەی ئیسلام و نەهێشتن و کەمکردنەوەی دەمارگیری مەزهەبی و حیزبی.

**ئامانجمان:**

ئاشناکردنی کۆمەڵگایە لە ئیسلامی ڕەسەن و دروستکردنی تاك و کۆیەتی بۆ تێگەشتن لە سەرچاوەکانی کە بریتین لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیح و ئاشکراکردنی ئەو شتانەی کە نامۆن بە ئیسلام و خراونەتە نێویەوە بە چەندین دەستەواژەی دەنگ و ڕەنگ و نوسراوی لە بوارەکانی بیروباوەڕ و ڕەوشت و ئاکار و پەروەردە و زانست و پزیشکی و گەشەی کۆمەڵایەتی.

**خودایە داوات لێ دەکەین دامەزراومان بکەیت ، وتەوفیقمان بدەیت بۆ هەر کار وگوفتارێکی جوان وچاك بەو شێوەیەیی کەخۆت لێی ڕازیت.**

**ستافی ماڵپەڕی بەهەشت**



## * پێشەکی وەرگێڕ :

الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ، وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ، وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى عَبْدِهِ وَرَسُوْلِهِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَأَصْحَابِهِ أَجْمَعِيْنَ .

**دوای ئەوە :**

**دەستم دایە وەرگێڕانی ئەم کتێبە زۆر گرنگ و بەنرخ و پڕ سوودە لە ناو مزگەوتی** (الشيخ عبد العزيز بن عبد الله بن باز رحمه الله) **لە شاری (مەککەی پیرۆز) لە بەرواری** (٥ / ذي الحجة / ١٤٣٦ هـ) **، وە هەر لە هەمان شوێن و ڕۆژێك دوای ئەوە لە بەرواری** (٦ / ذي الحجة / ١٤٣٦ هـ) **سوپاس بۆ خوای گەورە ئەم کتێبەم بە دەرس خوێند لای زانای بەناوبانگ و مامۆستای زۆر بەڕێزم (الشيخ صالح بن عبد الله بن حَمَد العُصيمي حفظه الله) وە ئیجازەشی پێدام بە سەنەدی خۆی لە زانای بەناوبانگ و ڕێزدارەوە** (الشيخ بكر أبو زيد) **و ئەویش لە زانای بەناوبانگ و ڕێـزدارەوە پێشەوا** (الشيخ عبد العزيز بن عبد الله بن باز رحمه الله) **کە دانەری کتێبەکەیە ، ئەمە لە میانەی سەفەری حەجی ساڵی (١٤٣٦ ك) لە خولێکدا بە ناوی (برنامج منافع العلم) ، ئەمەیش فەزڵی خوای**

گەورەیە بەسەرمەوە و شوکر و سوپاسی دەکەم بە شوکر و سوپاسێك که شایستەی خوا بێت .

مُحَمَّد عَبْدُ الرَّحَمن لَطِيف

## الإجازة برواية هذا الكتاب

## من مُترجِمه إلى اللغة الكردية عن شيخه :

الشيخ صالح بن عبد الله بن حمد العُصيمي حفظه الله

## طبقةُ السَّماع ( الطَّبقةُ الأُولَى )

قَالَ شَيْخُنَا الفَاضِلُ الكَرِيْمُ العَالِمُ الجَلِيلُ الشَّيْخُ صَالِحُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ حَمَدٍ العُصَيْمِيُّ حفظه الله :

(سَمِعَ عَلَيَّ جَمِيْعَ «الدَّعْوَة إِلَى اللهِ وَأَخْلَاق الدُّعَاة» بِقِرَاءَةِ غَيْرِهِ صَاحِبُنَا «مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ لَطِيفٍ الكُرْدِيُّ العِرَاقِيُّ» ، فَتَمَّ لَهُ ذَلِكَ فِي مَجْلِسٍ وَاحِدٍ بِالمِيْعَادِ المُثْبَتِ فِي مَحَلِّهِ مِنْ نُسْخَتِهِ .

وَأَجَزْتُ لَهُ رِوَايَتَهُ عَنِّي إِجَازَةً خَاصَّةً مِنْ مُعَيَّنٍ لِمُعَيَّنٍ فِي مُعَيَّنٍ ، بِمَا يَصِحُّ لِي مِنْ إِسْنَادٍ فِيْهِ ، وَمِنْهُ مَا أَخْبَرَنَا بِهِ بَكْرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ أَبُو زَيْدٍ - إِجَازَةً - عَنِ المُصَنِّفِ العَّلَامَّةِ عَبْدِ العَزِيْزِ بْنِ بَازٍ رَحِمَهُ اللهُ ، وَالحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِيْنَ .

صَحِيْحٌ ذَلِكَ

وَكَتَبَهُ صَالِحُ بْنُ عَبْدِ اللهِ بْنِ حَمَدٍ العُصَيْمِيُّ

يَوْمِ الأَحَدِ السَّادِسِ مِنْ شَهْرِ ذِي الحِجَّةِ سَنَةَ ١٤٣٦

فِي مَسْجِدِ العَّلَامَّة عَبْدِ العَزِيْزِ بْنِ بَازٍ رَحِمَهُ اللهُ بِمَدِيْنَةِ مَكَّةَ المُكَرَّمَّة) .



*** پێشەکی دانەر :**

الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ، وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ، وَلا عُدوَانَ إِلاَّ عَلَى الظَّالِمِيْنَ ، وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ، إِلَهَ الأَوَّلِينَ وَالآخَرِينَ ، وَقَيُّومَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِينَ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ وَخَلِيلُهُ وَأَمِينُهُ عَلَى وَحِيهِ ، أَرْسَلَهُ إِلَى النَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَدَاعِياً إِلَى اللهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجاً مُّنِيراً ، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَأَصْحَابِهِ الَّذِينَ سَارُوا عَلَى طَرِيقَتِهِ فِي الدَّعْوَةِ إِلَى سَبِيلِهِ وَصَبَرُوا عَلَى ذَلِكَ وَجَاهَدُوا فِيهِ حَتَّى أَظْهَرَ اللهُ بِهِم دِينَهُ وَأَعْلَى كَلِمَتَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ ، وَسَلَّمَ تَسْلِمَاً كَثِيرًا .

**دوای ئەوە :**

**بەڕاستی خوای پاك و پایەدار جنۆکە و مرۆڤی تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بە تەنها بیپەرستن بە بێ شەریك و هاوبەش بۆدانان، وە بۆ ئەوەی فەرمان و قەدەغەکراوەکانی گەورەڕابگیرێت ، وە بۆ ئەوەی بە ناو و سیفەتەکانییەوە**

بناسرێت ، هەروەکو چۆن خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ [الذاريات] .

واتە : من جنۆکە و مرۆڤم دروست نەکردووە تەنها بۆ پەرستنی خۆم نەبێت .

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ [البقرة] .

واتە : ئەی خەڵكینە پەروەردگارەکەتان بپەرستن کە ئێوە و ئەوانەی پێش ئێوەشی دروست کردووە بۆ ئەوەی لێی بترسن - بە ئەنجامدانی کردارە چاکە فەرمان پێکراوەکان و خۆپاراستن لە کردارە خراپە قەدەغەکراوەکان - .

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلۡأَرۡضِ مِثۡلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلۡأَمۡرُ بَيۡنَهُنَّ لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىۡءٍ عِلۡمَۢا ﴿١٢﴾ ﴾ [الطلاق] .

واتە : ئەو خوایەی کە حەوت ئاسمانەکانی دروست کردووە و لە زەویش بە هاووێنەی ئەوە و فەرمانی خوا دادەبەزێتە نێوانیان بۆ ئەوەی کە ئێوە بزانن بەڕاستی خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و بەڕاستی زانستی خوا هەموو شتەکانی گرتووەتەوە .

خوای پاك و پایەدار ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کە بوونەوەری دروست کردووە بۆ ئەوەی کە بپەرسترێت و گەورەڕابگیرێت و فەرمان و قەدەغەکراوەکانی گوێڕایەڵی بکرێت ، چونکە عیبادەت و پەرستن بریتیـیە لە تەوحید و یەکتاکردنەوەی خوا بە پەرستن

و گوێڕایـــەڵی کردنـــی لەگــەڵ گــەورەڕاگرتنی فەرمانـــەکانی و قەدەغەکراوەکانی .

هــەروەها خــوای گــەورە ئەوەشــی ڕوونکردووەتــەوە کــەوا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوانەی نێوانیانیشـی دروسـت کـردووە بـۆ ئەوەی کە بزانرێـت خـوا توانـای بەسـەر هـەموو شـتێکدا هەیـە و زانستی خوا هەموو شتەکانی گرتووەتەوە .

بەوەش دەزانرێت کـەوا بەشـێك لـە مەبەسـت و حیکمـەت لـە دروستکردنی بونەوەرەکان بریتی‌یە لەوەی کە خـوا بناسـرێت بـە ناو و سیفەتەکانی‌یەوە ، وە بزانرێت خـوا توانـای بەسـەر هـەموو شتێکدا هەیە و زانایە بە هەموو شتەکان ، هـەروەها بەشـێکی تـر لە مەبەست و حیکمەت لە دروستکردن و بـەدیهێنانیان بـریتـی‌یـە لەوەی کە بیپەرستن و بە گەورە و پـاکی ڕاگـرن و ملکـەچ بـن بـۆ گەورەیی خوا .

عیبادەت و پەرستن بریتییە لە ملكەچ بوون و زەلیلی دەربڕین بۆ خوای گەورە ، وە ئەو ئەركانەی كە خوا فەرمانی پێ كردوون بە ئەرك‌لەسەربووەكان ـ لە بەجێهێنانی فەرمان پێكراوەكان و وازهێنان لە قەدەغەكراوەكان ـ ناونراون بە عیبادەت و پەرستن لەبەر ئەوەی كە دەبنە هۆی ملكەچ بوون و زەلیلی دەربڕین بۆ خوای گەورە .

ئەنجا لەبەر ئەوەی كە عەقڵەكان ناتوانن سەربەخۆ ووردەكاری عیبادەت و پەرستن بزانن هەروەها ناشتوانرێت لە ڕێگەی عەقڵەكانەوە ئەحكامە شەرعیەكان بزانرێت لە فەرمان پێكراوەكان و قەدەغەكراوەكان بە شێوەیەكی وورد و درشت لەبەر ئەمە خوای پاك و پایەدار پێغەمبەرانی ناردووە و كتێبەكانی دابەزاندووە بۆ ڕوونكردنەوەی ئەو شتەی كە خوا بوونەوەری لە پێناودا دروست كردووە ، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو مەبەستە بۆ خەڵك ڕوون بكەنەوە و شیبكەنەوە تاوەكو بتوانن

خوا بپەرستن لەسەر بەرچاوڕۆشنی ، وە بۆ ئەوەی کە بتوانن وازبێنن لەوەی کە خوا قەدەغەی کردووە لێیان لەسەر بەرچاوڕۆشنی .

پێغەمبەران (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) بریتین لە ڕێنماییکاران و ڕێپیشاندەرانی خەڵك ، وە ئەوانن پێشەوایانی ڕێنمایی کردن و بانگخوازانی تێکڕای جنۆکە و مرۆڤ بۆ گوێڕایەڵی کردن و پەرستنی خوا ، خوای پاك و پایەدار بە پێغەمبەران ڕێزیناوە لە عەبد و بەندەکان و ڕەحمی پێکردوون بە ناردنیان بۆیان ، وە لەسەر دەستی ئەوان ڕێگای ڕێك و ڕاستی بۆ ڕوونکردوونەتەوە بۆ ئەوەی خەڵکی لەسەر بەرچاوڕوونی بن لە کاروبارەکانیان و بۆ ئەوەی نەڵێن : ئێمە نەماندەزانی خوا چی لە ئێمە ویستووە و ئێمە هیچ مژدەر و ورياكەرەوەيەكمان بۆ نەهاتووە ، لەبەر ئەوە خوای گەورە بیانووی بڕیوە و بە ناردنی پێغەمبەران و دابەزاندنی کتێبەکان بەڵگەی سەپاندووە

بەسەریاندا ، هەروەكو چۆن خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ ﴿٣٦﴾ ﴾ [النحل] .

واتە : بەدڵنیایی ئێمە لە نێو هەموو ئوممەتێك (كۆمەڵە مرۆڤێك)دا پێغەمبەرێكمان ناردووە بۆ ئەوەی پێیان بڵێ : خوا بپەرستن و خۆتان دووربخەنەوە لە (پەرستنی جگە لە خوا) .

هەروەها خوای پاك و دوور لە هەموو نوقصانیەك فەرموویەتی : ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾ [الأنبياء] .

واتە : هیچ پێغەمبەرێكمان لە پێش تۆ نەناردووە ئیللا وەحیمان بۆ ناردووە كەوا هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە من نەبێت بۆیە تەنها من بپەرستن .

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ ﴿٢٥﴾﴾ [الحديد] .

واتە : بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان ناردووە بە چەندین بەڵگەی روون و کتێب و تەرازوویشمان لەگەڵیاندا دابەزاندووە بۆ ئەوەی خەڵك بە عەدالەت و دادوەریەوە مامەڵە بکەن لە ئاست حەق و مافی خوا و لە ئاست حەق و مافی خەڵکیشدا .

هەروەها خوای پاك و دوور لە هەموو نوقصانیەك فەرموویەتی : ﴿كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِۚ ﴿٢١٣﴾﴾ [البقرة] .

واتە : پێشتر هەموو خەڵك یەك ڕیزبوون و لەسەر یەك دین و ئاین بوون کە بریتی بوو لە یەکخواپەرستی و دواتر جیاوازی

کەوتـە نێوانیانـەوە و بـە هـۆی ئـەوەوە خـوا پێغەمبـەرانی نـارد بەوەی کە مژدەدەر و وریاکەرەوە بن و کتێبی لەگەڵیاندا دابەزاند بە حەق بۆ ئەوەی کە دادوەری بکـەن لـە نێـوان خەڵکـدا و بڕیـار بدەن سەبارەت بەو شتانەی کە جیاوازی دەکەوێتە نێوانیانەوە .

لێـرەدا خـوای پـاك و پایـەدار ئـەوەی ڕوونکردووەتـەوە کـەوا پێغەمبـەرانی نـاردووە و کتێبـەکانی دابەزانـدووە بـۆ ئـەوەی کـە دادوەری بکەن لە نێوان خەڵکدا و بڕیار بدەن بە حەق و عەدالـەت ، وە بۆ ئەوەی کە بۆ خەڵکی روونبکاتـەوە ئـەوەی کـە جیـاوازی دەکەوێتە نێوانیانەوە لە بابەتەکانی شەریعەت و بیروباوەڕدا ، لـە یەکتاکردنەوەی خوا بە پەرستن و شەریعەتەکەی خـوای گـەورە ، چونکە فەرمایشتی خوای پاك و پایەدار : ﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾ واتە : **پێشتر هەموو خەڵك یەك ڕیزبـوون و لەسـەر حـەق بـوون** ، جیاوازی لە نێوانیاندا نەبوو لە سەردەمی (ئادەم)ـەوە (علیه الصلاة والسلام) تـاوەکو سـەردەمی (نـوح) ، وە هـەموو خـەڵك لەسـەر

هیدایەت و بەرچاوڕۆشنی بوون هەروەكو چۆن (ابن عبَّاس رضي الله عنهما) و كۆمەڵانێك لە (سەلەف) و لە (خەلەف)یش فەرموویانە ، ئەنجا پاشان شیرك و هاوبەشدانان بۆ خوا روویداوە لە ناو قەوم و گەلەكەی (نوح)دا ، ئەوەبوو جیاوازی كەوتە نێوانیانەوە ، وە جیاوازیش كەوتە نێوانیانەوە سەبارەت بەوەی كە واجب و پێویستە لەسەریان لە حەق و مافی خوای گەورە ، جا كاتێك كە شیرك و جیاوازی روویدا خوای گەورە (نوح)ی (علیه الصلاة والسلام) نارد و لە دوای ئەویش پێغەمبەرانی تری نارد هەروەكو چۆن خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ ﴿١٦٣﴾﴾ [النساء] .

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی ئێمە (وەحیی)مان ناردووە بۆ تۆ هەر وەكو چۆن (وەحیی)مان ناردووە بۆ (نوح) و پێغەمبەرانی دوای ئەو .

**هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی :** ﴿ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٦٤ ﴾ [النحل] .

واتە : وە ئێمە کتێبمان دانەبەزاندووەتە سەر تۆ ئیللا بۆ ئەوە نەبێت کە ڕوونیبکەیتەوە بۆ خەڵك ئەوەی کە جیاوازی دەکەوێتە نێوانیانەوە ، وە ڕێنمایی و ڕەحمەتیشە بۆ کەسانێك کە ئیمان بێنن .

کەواتە خوای گەورە کتێبی دابەزاندووە بۆ ئەوەی کە حوکم و بڕیاری خوا ڕوونبکاتەوە بۆ خەڵك سەبارەت بەوەی کە جیاوازی دەکەوێتە نێوانیانەوە تێیدا ، وە بۆ ئەوەی کە شەرعەکەی ڕوونبکاتەوە سەبارەت بەوەی کە خەڵك نایزانێت ، وە بۆ ئەوەی کە فەرمان بکات بە خەڵك بە وابەستەبوون و پابەندبوون بە شەرعی خواوە و ڕاوەستان لە ئاست سنوورە دیاریکراوەکانی ،

وە بۆ ئەوەی کە ڕێگری بکات لە خەڵك سەبارەت بەوەی کە زەرەر و زیانی تێدا هەیە بۆیان لە ئێستا و داهاتوویاندا .

وە خوای گەورە پێغەمبەرانی کۆتایی پێهێناوە بە باشترینیان و پێشەواکەیان و سەروەریان : پێغەمبەر و پێشەوا و سەروەرمان (مُحَمَّد)ی کوڕی (عَبْدُ اللهِ) صەڵات و سەلامی پەروەردگار لەسەر هەر هەموویان بێت ، ئەویش پەیامی خوای گەیاندووە و ئەمانەتەکەی بەجێهێناوە و ئامۆژگاری ئوممەتی کردووە و لە پێناوی خوادا تێکۆشاوە بە حەقی جیهاد و تێکۆشان ، وە بانگەوازی کردووە بۆ لای خوا بە نهێنی و ئاشکرا ، وە لە پێناوی خوادا ئەشکەنجە و ئازار و ئەزێتدراوە بە توندترین ئەشکەنجە و ئەزێت ، بەڵام ئەو صەبر و ئارامی گرت لەسەر ئەوە هەروەکو چۆن لە پێش ئەو پێغەمبەرانی تریش (علیهم الصلاة والسلام) صەبر و ئارامیان گرت ، وە دین و ئاینی خوای گەیاند هەروەکو چۆن ئەوان گەیاندیان ، بەڵام ئەم زیاتر ئەشکەنجە و ئەزێتدرا و صەبر

و ئارامی زیاتری گرت ، وە هەستا بە بەجێهێنانی ئەرکەکانی پەیامبەرایەتی بە تەواوترین شێوەی بەجێهێنان (علیه وعلیهم الصلاة والسلام) .

بیست وسێ ساڵ مایەوە پەیامەکانی خوای دەگەیاند و بانگەوازی بۆ لای دەکرد و ئەحکام و بڕیارەکانی بڵاودەکردەوە ، سیازدە ساڵ لەوە لە ناو شاری (أُمُّ القُرَى / مەککەی پیرۆز)دا سەرەتا بە نهێنی و پاشان بە ئاشکرا حەقی ڕاگەیاند و ئەزێتدرا ، وە صەبر و ئارامی گرت لەسەر بانگەوازکردن و لەسەر ئەشکەنجە و ئەزێتدانی خەڵکیش ، ئەمە لەکاتێکدا کە ئەوان ڕاستگۆیەتی و دەستپاکی پێغەمبەریان (ﷺ) دەزانی ، وە چاکێتی و پشت و ڕەچەڵەك و پلەوپێگەیشیان دەزانی ، بەڵام هەواوئارەزوو و حەسوودی و ملهوڕی لە گەورەکانیانەوە و نەفامی و لاسایی کردنەوەیش لە عەوام و کەسە سادەکانیانەوە وای لێکردن کە بەو شێوازە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن ، گەورەکانیان ئینکاری و نکوڵیان

کـرد و خۆیـان بـە گـەورەزانی و حەسـوودیان بـرد ، وە عـەوام و کەسە سادەکانیشیان لاسایی ئەوانیان کردەوە و شوێنیانکەوتن و خراپەیان کرد ، بە هۆی ئەوەوە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بـە توندترین شێوە ئەشکەنجە و ئەزێتدرا .

وە بەڵگەمان لەسەر ئەوەی کە گەورەکانیان حەقیان زانیوە و بەڵام ملهوڕیان کردووە و نکۆڵیان لـێکردووە فەرمایشتی خوای پاك و بەدوورە لە هەموو نوقصانیەك : ﴿قَدۡ نَعۡلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحۡزُنُكَ ٱلَّذِي يَقُولُونَۖ فَإِنَّهُمۡ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ٣٣﴾ [الأنعام] .

واتە : بەدڵنیایی ئێمە دەزانین ئەو قسانەی کە ئەوان دەیڵـێن تۆ بێتاقەت و غەمبار دەکات ، بەڕاستی ئەوان تۆ بەدرۆناخەنەوە بەڵام ستەمکاران ئینکـاری ئایەتـەکانی خـوا دەکـەن و باوەڕیـان پـێناهێنن .

لێرەدا خـوای پـاك و بـەدوور لـە هـەموو نوقصـانیەك ئـەوەی ڕوونکردووەتەوە کە کافر و موشریکەکان پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بەدرۆناخەنەوە بەڵکو ڕاستگۆیەتی و دەستپاکی ئـەو دەزانـن لـە ناخی خۆیاندا ، وە لە پێش ئـەوەی کـە وەحیـی بـۆ بێـت ناویـان دەبرد بە : (ڕاستگۆی دەستپاك / الصادقُ الأمين) ، بەڵام نکۆڵی و ئینکاری حەقیان کرد لەبەر حەسـوودی بردنیـان و دەسـتدرێژیان بـۆ سـەر پێغەمبـەر (عليه الصلاة والسلام) ، بـەڵام پێغەمبـەر (عليه الصلاة والسلام) گوێی بەوەنەدا و بایەخی پێنەدا ، بەڵکو صـەبر و ئارامی گرت و چاوەڕێی پاداشتی خوای کرد و بـەردەوام بـوو لـە گرتنەبەری ئەو ڕێگایە ، وە بەردەوام بوو لەسەر بانگەوازکردن بۆ لای خوای گـەورە و بـە ئـارام و خۆڕاگربـوو لەسـەر ئەشـکەنجە و ئەزێتەکان و موجاهید و تێکۆشەربوو بە بانگەوازکردن ، وە خۆیی دەگرتەوە لە ئەزێتدانی خەڵك و ئەزێتدانی ئەوانیشی هەڵدەگرت ، وە بە پێی توانایش چاوپۆشی دەکرد لەوەی کە لە ئەوانـەوە لـە

رووی ئەمدا دەکرا ، تاوەکو بارودۆخەکە توندتر و ناڕەحەت و ناهەموارتر بوو ، وە بڕیاری کوشتنی پێغەمبەریاندا (علیه الصلاة والسلام) ، ئەو کاتە خوا مۆڵەتی پێیدا کە دەربچێت بۆ مەدینە و ئەوەبوو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کۆچی کرد بۆی و مەدینە بوو بە پایتەختی یەکەمی ئیسلام و ئاینی خوا تێیدا دەرکەوت و سەرکەوت و موسڵمانان بوون بە خاوەنی دەوڵەت و هێز ، وە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەردەوام بوو لەسەر بانگەوازکردن و روونکردنەوەی حەق ، وە دەستی کرد بە جیهاد و تێکۆشان بە شمشێر ، وە چەندین نێردراوی نارد بۆ دەعوە و بانگەوازکردنی خەڵك بۆ لای خێر و هیدایەت و بانگەوازی پێغەمبەرەکەیانیان (علیه الصلاة والسلام) بۆیان روون دەکردەوە ، وە چەندین مەفرەزەی نارد و ئەو غەزا زانراوانەی ئەنجامدا کە لە سیرە و ژیاننامەی پێغەمبەردا (ﷺ) باسکراون تاوەکو خوا ئاینەکەی لەسەر هەردوو دەستی سەرخست و تاوەکو خوا ئاینەکەی پێ تەواو و

کـــاملْ کـــرد ، وە نیعمـــەتی خـــۆیی بەســـەر ئـــەو و بەســـەر ئوممەتەکەیشیدا تەواوکرد ، پاشان پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) وەفاتی کرد دوای ئەوەی کە خوا ئاینەکەیی پێ تەواو و کاملْ کرد و بە ڕوونی دینەکەی خوای گەیاند .

لە پاش ئەو صەحابەکانی ئەو ئەمانەتەیان هەلْگرت و لەسەر ڕێگا و ڕێبازەکەی ڕۆیشتن و بانگەوازیان کرد بۆ لای خوای گەورە و بە هـەموو لایـەکی تێکـڕای ناوچـە ئاوەدانـەکانی زەویـدا وەکـو بانگخواز بۆ لای حەق و موجاهیـد و تێکۆشـەر لـە پێنـاوی خـوای گەورەدا بلاّوەیان کرد و لە پێنـاوی خـوادا لـە لۆمـەی لۆمـەکاران نەدەترسان ، پەیامەکانی خوایان دەگەیاند و لـێی دەترسان و لە هیچ یـەکێکی تـر جگـە لـە خـوای گـەورە نەدەترسـان ، ئـەوەبوو بەسەر زەویدا وەکو هێرشبەر و موجاهید و تێکۆشـەر و بـانگخواز و ڕێپیشـاندەر و چـاکەکار و چاکسـازیکار بلاّوەیـان کـرد و ئـاینی خوایان بلاّودەکردەوە ، وە خـەلْکیان فێـری شـەریعەتەکەی خـوا

دەكرد و ئەو عەقیدە و بیروباوەڕەیان بۆیان ڕووندەكردەوە كە خوا پێغەمبەرانی پێناردووە ، كە بریتی‌یە لە پەرستنی خوا بە تەنها و وازهێنان لە پەرستنی هەموو شتێك جگە لە خوا لە دارودرەخت و بەرد و بت و جگە لەوانەیش ، بۆ ئەوەی لە هیچ كەسێك نەپاڕێنەوە جگە لە خوا نەبێت بە تەنها ، وە هانا و هاوار بۆ هیچ كەسێك نەبەن و داوای فریاكەوتن نەكەن جگە لە خوا نەبێت ، وە حوكم و فەرمانڕەوایی نەكرێت ئیللا بە شەرعەكەی خوا نەبێت ، وە نوێژ نەكرێت ئیللا بۆ ئەو نەبێت ، وە نەزركردن و عیبادەت لەخۆگرتن نەكرێت ئیللا بۆ ئەو نەبێت ، وە جگە لەوانەیش لە عیبادەت و پەرستنەكانی تر ، وە بۆ خەڵكییان ڕوونكردەوە كەوا عیبادەت و پەرستن حەق و مافی خوایە ، وە ئەو ئایەتانەیان بۆیان خوێندەوە كە لەو بارەیەوە هاتوون ، وەكو فەرمایشتی خوای پاك و بێگەرد : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ﴿٢١﴾ ﴾ [البقرة] ، واتە : ئەی خەڵكینە پەروەردگارەكەتان بپەرستن .

وە فەرمایشـــتی : ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ٢٣﴾ [الإسراء] ، واتە : پەروەردگارت بڕیاریداوە و فەرمانی کردووە بەوەی کەوا هیچ کەس و شتێك نەپەرستن تەنها ئەو نەبێت .

وە فەرمایشتی : ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ ، واتە : تەنها تۆ دەپەرستین و تەنها داوای یارمەتیش لە تۆ دەکەین .

وە فەرمایشـــتی : ﴿فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا ١٨﴾ [الجن] ، واتـــە : لەگەڵ خوادا هیچ کەسێکی تر مەپەرستن و هاواری تێمەکەن .

وە فەرمایشـــتی : ﴿قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٦٢ لَا شَرِيكَ لَهُۥۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرۡتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ١٦٣﴾ [الأنعـــام] ، واتـە : ئـەی پێغەمبـەر بـە خـەڵکی بڵـێ : بەڕاسـتی نوێـژکردن و حەیوان سەربڕین و ژیان و مردنم هەمووی بۆ خوای پەروەردگاری هـەموو جیهانیانـە ١٦٢ هـیچ شـەریکی نـیـە و بەمـەش فـەرمانم پێکراوە و من یەکەمین کەس دەبم لە

موسڵمانان بۆ بەجێهێنانی فەرمانەکانی خـوای گەورە .

وە صـەبر و ئارامیـان گـرت لەسـەر ئـەوە صـەبر و ئـارامێکی گەورە ، وە تێکـۆشان لـە پێنــاوی خـوادا تێکۆشــانێکی گـەورە (خوا ڕازی بێت لێیان و ئەوانیش ڕازی بکات بە پاداشتی خۆی) .

پاشــان پێشــەوایانی ڕێنمــایی و هیدایــەت لــە شــوێنکەوتوان (التابعـين) و شوێنکـەوتــوانی شوێنکـەوتــوان (أتباع التابعـين) لــە عەرەب و جگە لە عەرەبـیش لەوەدا شوێنیانکەوتــن و بەم ڕێڕەو و ڕێگایەدا ڕۆیشتن ڕێگای بانگەوازکردن بۆ لای خوای گەورە ، وە هەســتان بــە هــەڵگرتنی ئــەرك و بــاری بانگــەوازکردن و ئــەو ئەمانەتەیان گەیاند ، لەگەڵ ڕاستگۆیی و خۆڕاگری و نیازپاکی لە جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوا و کوشتارکردنی ئەو خەڵکانـەی کــە لــە ئاینەکــەی دەڕۆیشــتنە دەرەوە و ڕێگریــان دەکــرد لــە بڵاوبوونەوەی و ئەو جزیە و سەرانەیەیان نەدەدا کە خـوا فـەرزی

کردبوو ئەگەر لەو خەڵکانە ببوایەن کە جزیە و سەرانەیان دەکەوتەسەر .

ئەوانن هەڵگرانی بانگەواز و پێشەوایانی ڕێنمایی کردن و هیدایەتدان لە پاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، وە بەهەمان شێوە شوێنکەوتوانی صەحابە لە شوێنکەوتوان (التابعین) و شوێنکەوتوانی شوێنکەوتوان (أتباع التابعین) و پێشەوایانی ڕێنمایی کردن و هیدایەتدان هەمووان لەسەر ئەو ڕێگا و ڕێبازە ڕۆیشتن وەکو لە پێشەوە باسکرا ، وە لە پێناو ئەمەدا صەبر و ئارامیان گرت و دین و ئاینی خوا بڵاوبوویەوە و وتەی خوا بەرزبوویەوە لەسەر دەستی صەحابەکان و ئەوانەی کە شوێنیانکەوتن لە ئەهلی علم و ئیمان لە عەرەب و لە عەجەم لە ئەم جەزیرە و دوورگەیەدا بە باشوور و باکوریەوە و لە جگە لە جەزیرە و دوورگەی عەرەبیشدا لە هەموو لایەکی دونیاوە ، لەوانەی کە خوا بەختەوەری بۆ نووسیبوون و هاتنە ناو ئاینی

خواوە و بەشداریان كرد لە بانگەواز و تێكۆشان و جیهادكردن و صەبر و ئارامیان گرت لەسەر ئەوە و سەروەری و سەركردایەتی و پێشەوایەتی كردنیان لە ئایندا كەوتە دەست بە هۆی صەبرگرتن و خۆڕاگری و ئیمان و جیهاد و تێكۆشانیان لە پێناوی خوای گەورەدا ، وە ئەم فەرمایشتەی خوای پاك و بێگەردیان بەسەردا ساغدەبێتەوە كە لە باسی (بنو إسرائيل)دا فەرموویەتی : ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ [السجدة] ، واتە : وە كەسانێكمان لێكردوون بە ئیمام و پێشەوا هیدایەتی خەڵك دەدەن و ڕێنماییان دەكەن بە فەرمانی ئێمە كاتێك كە صەبر و ئارمیان گرت و دڵنیابوون بە ئایەتەكانی ئێمە .

ئەمە بەسەر صەحابەكانی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوانەیش كە لەسەر ڕێگا و ڕێبازی ئەوان ڕۆیشتن ساغدەبێتەوە ، بوون بە پێشەوا و هیدایەتدەر و ڕێنماییكار و بانگخواز بۆ لای حەق ، وە

بوون بە کۆمەڵە زانا و چاوساغێك کە خەڵکی چاویان لــێبکەن و شوێنیان بکەون بـە هـۆی صـەبرگرتن و خـۆڕاگری و ئیمانـداری و باوەڕیانەوە ، چونکە بەڕاستی بە صەبرو دڵنیابوون پێشـەوایەتی لە ئایندا بەدەست دەهێنرێت.

صەحابەکانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) و ئەوانـەیش کـە بە چاکە شـوێنیان کـەوتوون تـاوەکو ڕۆژگـاری ئـەمڕۆمان ئـەوانن پێشـەوا و ئەوانن هیدایەتـدەر و ڕێنماییکـار و ئەوانن

سەرکردە و چاوساغ بۆ ڕێگای حەق .

وە بەمەیش ئەوە بۆ قوتابی علم روون و ئاشکرا دەبێـت کـەوا بانگەوازکردن بۆ لای خوا لە گرنگترینی کارە گرنگەکانە ، وە ئـەم ئوممەتــە لــە هــەموو ســەردەم و شــوێنێکدا لــە ئــەو پــەڕی پێویســتیدایە بــۆی ، بــەڵکو لــە ئــەو پــەڕی زەرورەت و ناچارییبووندایە بۆ بانگەوازکردن بۆ لای خوا .

وە قسەکردنیش سەبارەت بە بانگەوازکردن بۆ لای خوای گەورە کورت و پوخت دەبێتەوە لە چەند بوارێکدا :

**بواری یەکەم : حوکم و فەزڵ و چاکەکانی بانگەوازکردن بۆ لای خوای گەورە .**

**بواری دووەم: چۆنێتی بەجێهێنانی بانگەوازکردن و شێوازەکانی.**

**بواری سێیەم: ڕوونکردنەوەی ئەو شتەی کە بانگەوازی بۆ لا دەکرێت.**

**بواری چوارەم : ڕوونکردنەوەی ئەو ڕەوشت و سیفەتانەی کە پێویستە بانگخوازەکان خۆیانی پێبڕازێننەوە و لەسەریان بڕۆن .**

# بواری یەکەم

## ڕوونکردنەوەی حوکمی بانگەوازکردن بۆ لای خوای گەورە و ڕوونکردنەوەی فەزڵ و چاکەکانی

### * حوکمی بانگەوازکردن بۆ لای خوای گەورە :

بەڵگەکان لە قورئان و سوننەت بەڵگەن لەسەر واجبێتی و پێویستبوونی بانگەوازکردن بۆ لای خوای گەورە و فەرزێکە لە فەرزەکانی ، بەڵگەیش سەبارەت بەمە زۆرن ، لەوانە : فەرمایشتی خوای پاك و بێگەرد : ﴿ وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٠٤ ﴾ [آل عمران] .

واتە : وە با کۆمەڵێك لە ئێوە بانگەواز بکەن بۆ لای خێر و فەرمان بکەن بە چاکە و ڕێگری بکەن لە خراپە و ئەوانەن کەسانی سەرفراز و براوە و سەرکەوتوو .

هەروەها لەوانە : فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴿١٢٥﴾ ﴾ [النحل] .

واتە : بانگەواز بکە بۆ لای ڕێگای خوا بە دانایی و ئامۆژگاری چاك و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکە بەوەی کە چاکترە .

هەروەها لەوانە : فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿وَٱدۡعُ إِلَىٰ رَبِّكَۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ [القصص] .

واتە : وە بانگەواز بکە بۆ لای پەروەردگارت و لە کەسانی هاوەڵبڕیادەر و موشریك مەبە .

هەروەها لەوانە : فەرمایشتی خوای پاك و بێگەرد : ﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ ﴿١٠٨﴾ ﴾ [يوسف] .

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا بڵێ ئەمە ڕێگاکەی منە بانگەواز دەکەم بۆلای خوا لەسەر بەرچاوڕۆشنی من و ئەوانەیش کە شوێنکەوتەی منن .

لێرەدا خوای پاك و بێگەرد ئەوەی روونکردووەتەوە کەوا شوێنکەوتوانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانن بانگخواز بۆ لای خوا و ئەوانن خەڵکانی بەرچاوڕۆشن ، وە ئەوەی کە واجب و پێویستە - وەکو زانراوە - بریتی‌یە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) و ڕۆیشتن لەسەر ڕێباز و بەرنامەکەی ، هەروەکو چۆن خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ [الأحزاب] .

واتە : بەدڵنیاییەوە چاولێکراوێکی باشتان بۆ هەیە لە پێغەمبەری خوادا بۆ کەسێك کە ئومێدی گەیشتن بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێت و زیکری خوا زۆر بکات .

وە زانایان ڕاشكاوانە ئەوەیان دەربڕیوە كە بانگەوازكردن بۆ لای خوای گەورە فەرزە لەسەر هەندێك لە موسڵمانان (فرضُ كفايةٍ) ئەمە سەبارەت بە ئەو وڵاتانەی كە بانگخوازیان تێدایە ، چونكە بەڕاستی هەموو وڵاتێك و هەموو هەرێم و ناوچەیەك پێویستی هەیە بە دەعوە و بانگەوازكردن و بە هەبوونی چالاكی تێیدا ، بۆیە دەعوە و بانگەوازكردن فەرزە لەسەر هەندێك لە موسڵمانان ئەگەر كەسانێك پێی هەستان كە بەس بێت ئەوا ئەو ئەرك و واجبە لەسەر ئەوانی تر دەكەوێت و ئەو كاتە بانگەوازكردن لە حەق و ئاستی ئەوانی تردا دەبێتە سوننەتی جەختلەسەركراو و كردەوەیەكی چاكی گەورە .

وە ئەگەر خەڵكی هەرێمێك یان وڵاتێكی دیاریكراو هەڵنەسان بە دەعوە و بانگەوازكردن بە شێوازێكی تەواو ئەوا تاوانەكە گشتگیر دەبێت و ئەرك و واجبەكە دەكەوێتە سەر هەموویان ، وە پێویستە لەسەر هەموو مرۆڤێك هەڵبسێت بە دەعوە و

بانگەوازکردن بە پێی وزە و توانای خۆی ، بەڵام بە تێڕوانین بۆ تێکڕای وڵات ئەوا پێویستە کۆمەڵێك ڕاستببنەوە و هەستن بە دەعوە و بانگەوازکردن بۆ لای خوای گەورە لە هەموو لایەکی ئاوەدانی سەر رووی زەویدا ، هەستن بە گەیاندنی پەیامەکانی خوا و فەرمانی خوا روونبکەنەوە بەو ڕێگایانەی کە لە تواناادا هەیە ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) بانگخوازانی ناردووە بۆ لای خەڵك و نامە و نووسراویشی ناردووە بۆ پادشا و سەرۆکەکان و بانگەشەیانی کردووە بۆ لای خوای گەورە .

وە لە ڕۆژگاری ئێستادا خوای گەورە کاروباری دەعوە و بانگەوازکردنی زیاتر ئاسان کردووە ، ئەویش بە چەندین ڕێگا کە بۆ ئەوانەی پێش ئێمە بەدی نەهاتبوو ، هەر بۆیە بوارەکانی دەعوە و بانگەوازکردن زیاتر ئاسان بووە بە چەندین ڕێگای زۆر و لە ڕۆژگاری ئێستادا سەپاندنی بەڵگە (إقامةُ الحُجَّة) بەسەر خەڵکدا بە چەندین ڕێگای هەمەجۆر دەکرێت : لە ڕێگای پەخشی

ئیزگە و لە ڕێگای تەلەفزیون و لە ڕێگای رۆژنامەگەری و چەندین ڕێگای جیاوازی تریش ، بۆیە واجب و پێویستە لەسەر ئەهلی علم و ئیمان و لەسەر جێنیشینەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەستن بە ئەم ئەرك و واجبە ، وە پاڵپشتی یەکتر و هاوکاری یەکتر بکەن تێیدا ، وە پەیامەکانی خوا بگەیەنن بە عەبدەکانی خوا و لە پێناوی خوادا لە گلەیی و لۆمەی هیچ لۆمەکارێك نەترسن ، وە لەو پێناوەدا ڕووگێرنەبن و بە هۆی ئەوەیشەوە چاوپۆشی نە لە گەورە و نە لە بچووك و نە لە دەوڵەمەند و نە لە فەقیر نەکەن ، بەڵکو فەرمانی خوا دەگەیەنن بە عەبدەکانی خوا هەروەکو چۆن خوا دایبەزاندووە و چۆن شەرعیەتی پێداوە ، وە هەندێك جار ئەوە دەبێت بە فەرزی دیاریکراو (فرضُ عَينٍ) ئەگەر تۆ لە شوێنێکدابیت و هیچ کەسێکی تێدا نەبێت بەو ئەرکە هەستێت جگە لە تۆ ، وەکو فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە ، ئەویش هەندێك جار دەبێت بە فەرزی دیاریکراو (فرضُ عَينٍ) و

هەندێك جاریش دەبێت بە فەرز لەسەر هەندێك لە موسڵمانان (فرضُ كفايةٍ) ، جا ئەگەر تۆ لە شوێنێکدابیت و هیچ کەسێکی تێدا نەبێت کە توانای بەسەر ئەم کارەدا بشکێت و فەرمانی خوا بگەیەنێت جگە لە تۆ ئەوا واجب و پێویستە لەسەر تۆ بەو کارە هەستیت ، بەڵام ئەگەر کەسانێکی تریش هەبوون هەستن بە کاری دەعوە و بانگەوازکردن و گەیاندنی ئاین و فەرمانکردن و ڕێگریکردن جگە لە تۆ ئەوا ئەو کاتە هەستان بەو کارە لە حەق و ئاستی تۆدا دەبێت بە سوننەت ، وە ئەگەر دەستپێشخەری بۆ بکەیت و سووربیت لەسەری ئەوا بەوە دەبیت بە کەسێکی کێبڕکێکار لە کارە خێرەکان و پێشبڕکێکار لە تاعەتەکاندا ، وە لەوەی کە کراوەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە دەعوە و بانگەوازکردن فەرزە لەسەر هەندێك لە موسڵمانان (فرضُ كفايةٍ) ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە : ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى

ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾

﴾ [آل عمران] .

واتە : وە با كۆمەڵێك لە ئێوە بانگەواز بكەن بۆ لای خێر و فەرمان بكەن بە چاكە و ڕێگری بكەن لە خراپە و ئەوانەن كەسانی سەرفراز و براوە و سەركەوتوو .

ئیمامی (الحافظ ابنُ كثیر) و كۆمەڵێك لە زانایان فەرموویانە ـ ئەمە واتای وتەكەیانە ـ : با كۆمەڵێك لە ئێوە خۆیان ئامادەباش و سازبكەن بۆ بەجێهێنانی ئەم كارە گەورەیە و دەعوە و بانگەواز بكەن بۆ لای خوا و ئاینەكەی بڵاوبكەنەوە و فەرمانی خوای پاك و گەورە و پایەدار بگەیەنن .

هەروەها زانراوە كە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەعوە و بانگەوازی كردووە بۆ لای خوا و لە مەككەدا بە پێی توانای خۆی هەستاوە بە بەجێهێنانی فەرمانی خوا ، وە بە هەمان شێوە

صەحابەکانیش (خوا ڕازی بێت لێیان و ئەوانیش ڕازی بکات بە پاداشتی خۆی) هەستاون بەو کارە بە پێی توانای خۆیان ، پاشان کاتێکیش کە هیجرەت و کۆچیان کرد زیاتر و کاریگەرتر هەستان بە دەعوە و بانگەوازکردن ، وە کاتێکیش کە لە پاش مردنی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بە ناو وڵاتاندا بڵاوبوونەوە بە هەمان شێوە هەستان بە دەعوە و بانگەوازکردن (رضي الله عنهم وأرضاهم) ، هەریەکەو بە پێی توانا و بە پێی زانستی خۆی .

کەواتە لە کاتی کەمی بانگخوازان و لە کاتی زۆربوونی خراپەکاریەکان و لە کاتی زاڵبوونی جەهل و نەزانی وەکو ڕۆژگاری ئێستامان ، لەم کاتانەدا دەعوە و بانگەوازکردن دەبێت بە فەرزی دیاریکراو (فرضُ عَينٍ) لەسەر هەموو یەکێك هەریەکەو بە پێی توانای خۆی ، وە ئەگەر لە شوێنێکی سنووردیاریکراودا بوو وەکو گوندێك یان شارێك و هاوشێوەی ئەوە و کەسانێکی تێدا بینی کە سەرپەرشتی ئەم کارەیان دەکرد و پێی هەستابوون و

فەرمانی خوایان گەیاندبوو ئەوا هەندە بەسە و ئەو کاتە گەیاندنی ئاینی خوا لە حەق و ئاستی ئەودا دەبێت بە سوننەت ، چونکە سەپاندنی بەڵگە (إقامةُ الحُجَّة) بەسەر خەڵكدا لەسەر دەستی جگە لە ئەو بەدیهاتووە و فەرمانی خوا لەسەر دەستی جگە لە ئەو جێبەجێکراوە .

بەڵام سەبارەت بە ئەوەی کە ماوەتەوە لە زەوی خوا و ئەوەی کە ماوەتەوە لە خەڵك ئەوا واجب و پێویستە لەسەر زانایان بە پێی توانای خۆیان و لەسەر کاربەدەستانیش بە پێی توانای خۆیان کەوا فەرمانی خوا بگەیەنن بە هەموو ئەوەی کە لە توانایاندا هەیە و ئەمەیش دەبێت بە فەرزی دیاریکراو (فرضُ عَينٍ) لەسەر هەر هەموویان بە پێی وزە و توانا .

وە بەمەیش دەزانرێت کە دەعوە و بانگەوازکردن فەرزی دیاریکراوە (فرضُ عَينٍ) و فەرزە لەسەر هەندێك لە موسڵمانان (فرضُ كفايةٍ) شتێکی ڕێژەییە و جیاوازە ، چونکە هەندێك جار

دەعوە و بانگەوازکردن دەبێت بە فەرزی دیاریکراو (فرضُ عَينٍ) سەبارەت بە خەڵکانێك و سەبارەت بە کەسانێك ، وە دەشبێت بە سوننەت سەبارەت بە کەسانێکی تر و خەڵکانێکی تر لەبەر ئەوەی لە جێی نیشتەجێبوون و لە شوێنەکەی ئەوانیدا کەسانێکی تر و خەڵکانێکی تر هەبوون کە هەستاون بەو کارە و ئەوە جێی ئەوانی گرتووەتەوە و ئەو ئەرکەی لەسەریان خستووە .

بەڵام سەبارەت بە کاربەدەستان و ئەوانەیش کە توانا و دەسەڵاتێکی فراوانیان هەیە ئەوا لەم واجب و ئەرکەدا زیاتریان دەکەوێتەسەر ، وە پێویستە لەسەریان ئەو دەعوە و بانگەوازە بگەیەنن بەوەندەی کە لە توانایاندا هەیە لە وڵاتان بە پێی توانا و بەو ڕێگایانەی کە لە تواناندا هەیە و بەو زمانە زیندووانەی کە خەڵکی قسەیان پێدەکەن ، پێویستە فەرمانی خوا بگەیەنن بە هەموو ئەو زمانانە بۆ ئەوەی ئاینی خوا بگات بە هەموو یەکێك

بەو زمانەی کە دەیزانێت ، بە زمانی عەرەبی و جگە لەویش ، چونکە ئەم کارە ئێستا لە تواناندا هەیە و ئاسانە بەو ڕێگایانەی کە لە پێشەوە روونکرانەوە ڕێگاکانی ئیزگە و تەلەفزیون و ڕۆژنامەگەری و جگە لەوانەیش لەو ڕێگایانەی کە لە ڕۆژگاری ئێستادا ئاسانبوون و لەبەردەستدا هەن و لە پێشتردا ئاسان نەبوون و لەبەردەستدا نەبوون .

هەروەها پێویستیشە لەسەر وتارخوێنەکان کە لە کاتی بۆنە و ئاهەنگەکان و لە جومعەکان و لە جگە لەوانەیشدا ئەوەندەی کە لە توانایاندا هەیە لە فەرمانی خوای گەورە بگەیەنن ، وە بە پێی وزە و توانایان و بە پێی زانستیان ئاینی خوا بڵاوبکەنەوە .

وە لەبەر ئەوەی کە بانگەشەکردن بۆ بنەما رووخێنەرەکان و بۆ ئیلحاد و بێباوەڕی و ئینکاری کردنی هەبوونی خوای پەروەردگاری عەبدەکان و ئینکاری کردنی پەیامەکان و ئینکاری کردنی ڕۆژی دوایی و بڵاوبوونەوەی بانگەوازی گاورێتی (النصرانية)

لە زۆرێك لە وڵاتاندا و جگە لەمانەیش لە بانگەوازە گومڕاکەرەکان .. لەبەر ئەمە بەڕاستی دەعوە و بانگەوازکردن بۆ لای خوا لە ڕۆژگاری ئێستادا بووە بە فەرزێکی گشتی و بووە بە کارێکی واجب و پێویست لەسەر هەموو زانایان و لەسەر هەموو ئەو کاربەدەستانەیش کە دینداری دەکەن بە ئاینی ئیسلام و موسڵمانن ، فەرزە لەسەر هەر هەموویان کەوا ئاینەکەی خوا بگەیەنن بە پێی وزە و توانا بە نووسین و وتارخوێندن و بە ئیزگە و بە هەموو وەسیلە و ڕێگا و ئامرازێك کە لە توانایاندا هەبێت ، وە نابێت لەو کارە ڕابوەستن و خۆیان دوابخەن و پێی هەڵنەسن یان پاڵبدەنەوە لەسەر (زەید) یان (عەمر) چونکە بەڕاستی ئەمڕۆ ئیحتیاجی و بۆپێویستبوون بەڵکو زەرورەت و بۆناچاربوون زۆر گرنگ و پێویستە بۆ هاوکاریکردنی یەکتر و بەشداریکردن و پاڵپشتیکردنی یەکتر لەم کارە گەورەیەدا زیاتر لەوەی کە پێشتر هەبووە ، چونکە بەڕاستی دووژمنانی خوا بە

هەموو وەسیلە و ڕێگایەك پاڵپشتی و هاوکاری یەکتر دەکەن لە پێناو ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی ڕێگا و بەرنامەکەی خوا و گومان درووستکردن لە ئاینەکەی و بانگەوازکردنی خەڵك بۆ ئەوەی کە دەریان دەهێنێتە دەرەوە لە دین و ئاینەکەی خوای گەورە .

بۆیە واجب و پێویستە لەسەر ئەهلی ئیسلام کە لە بەرامبەر ئەم چالاکی‌یە ئیلحادی و بێباوەڕیەدا بوەستنەوە بە چالاکی موسڵمانانە و بە دەعوە و بانگەوازی موسڵمانانە لەسەر هەموو ئاستەکان و بە هەموو وەسیلە و ئامرازەکان و بە هەموو ئەو ڕێگایانەی کە لە توانادا هەیە ، وە ئەمەیش لە بابەتی بەجێهێنای ئەوەیە کە خوا واجب و پێویستی کردووە لەسەر عەبدەکانی لە دەعوە و بانگەوازکردن بۆ لای ڕێگا و بەرنامەکەی .

## * فەزڵی بانگەوازکردن :

وە سەبارەت بە فەزڵ و چاکە و گەورەیی بانگەوازکردن و بانگخوازان چەندین ئایەت و فەرموودەی زۆر هاتوون ، هەروەها سەبارەت بەوەیش کە پێغەمبەر (ﷺ) بانگخوازانی ناردووە بۆ دەعوە و بانگەوازکردن چەندین فەرموودە هاتووە کە شاراوەنین بە لای ئەهلی علمەوە ، وە لەوانە فەرمایشتی خوای گەورەیە : ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾ [فصلت] .

واتە : وە کێ هەیە وتە و کاری باشتر بێت لەو کەسەی کە دەعوە و بانگەواز دەکات بۆ لای خوا و کردەوەی چاکە دەکات و دەڵێت من یەکێکم لە موسڵمانان .

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی تێدایە بە پلە بەرزی و گەورەیی بانگخوازان و ستایشکردنیان ، وە بەوەی کەوا هیچ یەکێك نییە

وتــە و کــاری لــەوان باشــتر بێــت ، وە لەســەرووی هەموویانــەوە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) پاشان شـوێنکەوتوانیان بـە پـێی پلەیان لە بانگەوازکردن و زانست و چاکەدا ، کەواتە ئـەی عەبـدی خوا بەسە بۆ ڕێزداری تۆ کە ببیت بـە بەشـێك لـە شـوێنکەوتوانی پێغەمبـەران و بچـیتە ڕیـزی ئەوانـەی کـە لـەم ئایەتـە پـیرۆزەدا باســـکراون : ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ٣٣﴾ [فصلت] .

واتاکەی ئەوەیە : **هیچ یەکێك نیە** وتە و کاری باشتر بێت لە ئەو چونکە ئەو دەعوە و بانگەواز دەکات بـۆ لای خـوا و ڕێنمـایی دەکات بۆ لای و کردەوەیش دەکات بـەوەی کـە بانگـەوازی بـۆ لا دەکــات ، واتــە : دەعــوە و بانگــەواز دەکــات بــۆ لای حــەق و کردەوەیشی پێ دەکات ، وە ئینکاری باتڵ دەکات و خەڵکی لــێ وریا دەکاتەوە و وازی لـێدێنێت ، وە لەگەڵ ئەوەیشدا ڕاشکاوانە ئەو بەرنامە و ڕێبازەیش دەردەبڕێت کە ئەو لەسەریەتی و شـەرم

ناکات و بەڵکو دەڵێت : من یەکێکم لە موسڵمانان ، وە خۆشحاڵ و شادومان و دڵخۆشە بەوەی کە خوا منتەتی پێکردووە بەسەریدا ، وە وەکو ئەو کەسە نییە کە لەبەر خۆبەگەورەزانی خۆی دەگرێتەوە لەوە و پێی ناخۆشە ئەوە دەرببڕێت و بڵێت : من موسڵمانم یان ئەو دەعوە و بانگەواز دەکات بۆ لای ئیسلام ئەوەیش لەبەر لەبەرچاوگرتنی هەستی فلان یان بە مەبەستی رووپامایی کردنی فلان (وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰه) ! بەڵکو کەسی ئیمانداری بانگخواز بۆ لای خوا کە ئیمانەکەی بەهێزە و بەرچاوڕۆشنە بە فەرمانی خوا ڕاشکاوانە حەقی خوا دەردەبڕێت و ڕایدەگەیەنێت و چالاك دەبێت لە دەعوە و بانگەوازکردن بۆ لای خوا و کردەوەیش دەکات بەوەی کە بانگەوازی بۆ لا دەکات ، وە وریایش دەبێت لەوەی کە ڕێگری لێدەکات ، هەر بۆیە ئەو لە خێراترینی خەڵك دەبێت بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی کە بانگەوازی بۆ لا دەکات ، وە لە دوورترینی خەڵك دەبێت لە هەموو ئەوانەی

کە ڕێگری لێ دەکات ، وە لەگەڵ ئەوەیشدا ڕاشکاوانە ئەوە دەردەبڕێت کە ئەو موسڵمانە و بانگەوازیش دەکات بۆ لای ئیسلام ، وە بەوەیش خۆشحاڵ و شادومان و دڵخۆشە هەروەکو چۆن خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ [يونس] .

واتە : بڵێ : بە فەزڵ و ڕەحمەتی خوا ئا بەوە با دڵخۆش ببن ئەوە باشترە لەوەی کە کۆی دەکەنەوە لە ماڵی دونیا .

کەواتە دڵخۆشبوون بە ڕەحمەت و فەزڵی خوا دڵخۆشبوونی خۆشی دەربڕین و دڵخۆشبوونی خۆشحاڵبوون کارێکی شەرعی‌یە ، بەڵام ئەو دڵخۆشبوونەی کە نەهی لێکراوە و قەدەغەکراوە ئەوە بریتی‌یە لە دڵخۆشبوونی خۆبەگەورەزانی ، وە ئەم دڵخۆشبوونە ئەوەیە کە نەهی لێکراوە و قەدەغەکراوە هەروەکو خوای گەورە لە بەسەرهاتی قاروندا فەرموویەتی : ﴿ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ

ٱلۡفَرِحِينَ ٧٦﴾ [القصص] ، واتە : دڵخۆش مەبە چونکە بەڕاستی خوا کەسانی دڵخۆشی خۆشناوێت .

ئەمە دڵخۆشبوونی خۆبەگەورەزانی و خۆبەرزڕاگرتن و خۆگەورەڕاگرتنە بەسەر خەڵکەوە ، ئەمە ئەوەیە کە نەهی لێکراوە و قەدەغەکراوە .

بەڵام دڵخۆشبوونی خۆشحاڵبوون و خۆشی دەربڕین و شادبوون بە ئاینەکەی خوا و دڵخۆشبوون بە هیدایەت و ڕێپیشاندانی خوا و مژدەخواستن بەوە و دەربڕینی ئەوەی کە تۆ دینداریت بۆ ئەوەی بزانرێت ئەمە کارێکی شەرعی و بەچاکەباسکراو و ستایشکراوە .

کەواتە ئەم ئایەتە پیرۆزە : ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ ...﴾ لە ڕوونترینی ئایەتەکانە کە بەڵگە بێت لەسەر فەزڵ و چاکە و گەورەیی دەعوە و بانگەوازکردن و یەکێکە لە گرنگترینی ئەو

كارانـەی كـە پـێی لـە خـوا نزیـك دەبێتـەوە و لـە چـاكترینی تاعەتەكانە ، وە ئـەهلی دەعـوە و كەسـانی بـانگخوازیش لـە ئـەو پـەڕی ڕێـز و بـەرزترین پلەوپایـەدان ، وە لـە سـەرووی هەمووشـیانەوە پێغەمبـەرانن (علیهم الصلاة والسلام) و كـاملترین و تەواوترینیشیان لەوەدا كۆتایی پێهێنەر و پێشـەوا و سـەروەریانە پێغەمبەرمان (مُـحَمَّد) باشترین دروود و سەلامی خوا لەسەر ئەو و ئەوانیش بێت .

هەروەها لەوانە فەرمایشتی خوای گەورەیـە : ﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ ﴿١٠٨﴾ ﴾ [یوسف] .

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا بڵێ ئەمە ڕێگاكەی منـە بانگـەواز دەكـەم بـۆ لای خـوا لەسـەر بەرچاوڕۆشـنی مـن و ئەوانـەیش كـە شوێنكەوتەی منن .

لێرەدا خوای پاك و بێگەرد ئەوەی روونکردووەتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەعوە و بانگەوازدەکات لەسەر بەرچاوڕۆشنی ، وە شوێنکەوتوانیشی بەهەمان شێوە ، ئەمەیش فەزڵ و چاکە و گەورەیی دەعوە و بانگەوازکردنی تێدایە ، وە شوێنکەوتوانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانن بانگخواز بۆ لای ڕێگای خوا لەسەر بەرچاوڕۆشنی ، وە بەرچاوڕۆشنیش بریتی‌یە لە هەبوونی علم و زانست بەوەی کە دەعوە و بانگەوازی بۆ لا دەکات و بەوەیش کە نەهی و ڕێگری لێ‌دەکات ، وە ئەمەیش ڕێزداری و بەچاکدانانی تێدایە بۆیان .

وە پێغەمبەری ڕێزداریش (علیه الصلاة والسلام) لە فەرموودەیەکی صەحیحدا فەرموویەتی : ((مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ))[١] ، واتە : هەرکەسێك ڕێنمایی بکات بۆ خێر و چاکەیەك ئەوا

---

[١] صحيح مسلم رقم : (١٨٩٣) .

(٢) صحيح مسلم رقم : (٢٦٧٤) .

پاداشتی بۆ هەیە وەك پاداشتی ئەو كەسەی كە ئەو خێر و چاكەیە ئەنجامدەدات .

**هەروەها پێغەمبەر** (عليه الصلاة والسلام) **فەرموویەتی :** ((مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى كَانَ لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا ، وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلاَلَةٍ كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا))[٢].

**واتە : هەركەسێك دەعوە و بانگەواز بكات بۆ هیدایەت و ڕێپیشاندان بۆ چاكەكاری ئەوا پاداشتی بۆ هەیە وەك پاداشتی ئەو كەسانەی كە شوێنی دەكەون ، بەبێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی ئەوان كەم بكات ، وە هەركەسێكیش دەعوە و بانگەواز بكات بۆ لای گومڕایی ئەوا تاوان و گوناهی لەسەرە وەك تاوان و گوناهی ئەو كەسانەی كە شوێنی دەكەون ، بەبێ ئەوەی هیچ لە تاوان و گوناهی ئەوان كەم بكات .**

وە ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر فەزڵ و چاکە و گەورەیی دەعـوە و بانگەوازکردن بۆ لای خوای گەورە .

هـەروەها بـە صـەحیحی لـە پێغەمبـەرەوە (علیه الصلاة والسلام) هاتووە کە بە (عَلي رضي الله عنه وأرضاه) فەرمووە : ((فَوَاللَّهِ لأَنْ يَهْدِيَ اللَّهُ بِكَ رَجُلاً وَاحِدًا خَيْرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ))[٣].

واتە : سوێند بە خـوا ئەگـەر خـوا بـە هـۆی تـۆوە هیدایـەتی تەنها یەك پیاو بدات بۆ ناو ئیسلام ئەوا بۆ تۆ باشترە لـە وشـتری سوور .

وە ئەمەیش بەڵگەیە بۆمان لەسەر فەزڵ و چـاکە و گـەورەیی دەعــوە و بانگــەوازکردن بــۆ لای خــوا و چ خێــر و پاداشــتێکی گەورەی تێدایە ، وە بەڵگەیشە لەسەر ئەوەی کە کەسی بانگخواز بۆ لای خـوای گـەورە پاداشـتی پێدەدرێـت وەکـو پاداشـتی ئـەو کەسانەی کە لەسەر هەردوو دەستی ئەو خوا هیدایەتیداون ئەگەر

---

[٣] صحيح البخاري رقم : (٣٤٩٨) وصحيح مسلم رقم : (٢٤٠٦) .

چـی هـەزاران ملیـۆنیش بـن ، وە ئـەی کەسـی بـانگخواز وەکـو پاداشـتی ئـەوانت پێدەدرێـت ، ئـەم خێـر و پاداشـتە گەورەیـەت لـێپیرۆز بێت ئەی کەسی بانگخواز .

هەروەها بەمەیش ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) پاداشتی پێدەدرێت وەکو پاداشتی شوێنکەوتوانی ، ئا ئەمە چ ناز و نیعمەتێکی گەورەیە دەدرێت بە پێغەمبەرمان (علیه الصلاة والسلام) لـە ڕۆژی قیامەتـدا پاداشـتی پێدەدرێـت وەکـو پاداشتی شوێنکەوتوانی ، چونکە ئەو پەیامی خوای پێگەیاندوون و ڕێنمـایی کـردوون بـۆ خێـر و چـاکە (علیه الصلاة والسلام) ، وە بەهەمان شێوە پێغەمبەرانی تریش (علیهم الصلاة والسلام) پاداشـتیان پێدەدرێـت وەکـو پاداشتـی شوێنکەوتوانـیان ، وە بەهەمـان شێوە تـۆیش ئەی بـانگخواز لـە هـەموو سـەردەمانێکدا پاداشـتت پێدەدرێت وەکو پاداشتی شوێنکەوتوانت و ئەوانەی کە دەعوە و

بانگەوازەکەتـیان قەبوڵ کـردووە ، هـەر بۆیـە ئـەم خێـر و چـاکە گەورەیە دەستی خۆت بخە و پەلە و دەستپێشخەری بۆ بکە .

## بواری دووەم

## ڕوونکردنەوەی

## چۆنێتی بەجێهێنانی بانگەوازکردن و شێوازەکانی

وە سەبارەت بە چۆنێتی بانگەوازکردن و شێوازەکانی ئەوا خوای گەورە ڕوونی کردووەتەوە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا و لەوەیشدا کە لە سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا (عليه الصلاة والسلام) هاتووە ، وە لە ڕوونترینی ئەو بەڵگانە فەرمایشتی خوای گەورەیە : ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴿١٢٥﴾ ﴾ [النحل] .

واتە : بانگەواز بکە بۆ لای ڕێگای خوا بە حیکمەت و ئامۆژگاری چاك و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکە بەوەی کە چاکترە .

خوای پاك و بێگەرد ئەو چۆنێتیەی ڕوونکردووەتەوە کە دەبێت ببێتە سیفەت لە کەسی بانگخوازدا و بیشیگرێتەبەر ،

سـەرەتا بـە حیکمـەت دەسـت پێدەکـات ، وە مەبەسـتیش بـە حیکمـەت لێـرەدا بـریتـیـیە لـە بەڵگـە باوەڕپێهێنـەرە روونـە دەرخەرەکانی حەق و هەڵوەشێنەرەوەکانی باتڵ و ناحەق ، لەبەر ئەمە هەندێك لە ڕاڤەکارانی قورئان فەرموویانـە : واتـە بـە قورئـان چـونکە قورئـان گـەورەترین حیکمەتـە چـونکە روونکردنـەوە و ئاشکراکردنی حەقی تێدایە بە تـەواوترین شـێوە ، وە هەنـدێکیان فەرموویانە : واتە بە بەڵگەکانی قورئـان و سـوننەت ، بەهـەرحاڵ حیکمەت وشەیەکی گەورەیـە ، واتاکـەی بـریتـیـیە لـە دەعـوە و بانگەوازکردن بـۆ لای خـوا بـە زانسـت و لەسـەر بەرچاوڕۆشـنی و بەڵگە روونە باوەڕپێهێنـەرە دەرخـەر و روونکـەرەوەکانی حـەق ، حیکمـــەت وشـــەیەکی هاوبەشـــە بـــۆ چـــەندین واتـــای زۆر بـــەکاردەهێنرێت : بـــۆ واتـــای پێغەمبەرایـــەتی و زانســـت و شارەزابوون لە ئاین و عەقڵ و خۆپاراستن لە شتە زەرەرگەیەنـەر و گومان لـێکراوەکان و بۆ شتانێکی تـریش بـەکاردەهێنرێت ، وە

ئەم وشەیە لە ئەصلّ و بنەوادا وەکو (الشوكاني) ڕەحمەتی خـوای لێبێت فەرموویەتی بریتی‌یە لە : ئەو شتەی کە دەبێتە ڕێگر لە نەزانکاری ، ئا ئەمە حیکمەتە ، واتە : هەر وشەیەك و هەر وتەیەك ڕاتبچەڵەکێنێت و دوورتبخاتەوە لە نەزانکاری و سەرزەنشتت بکات لە باتڵ و ناحەق ئەوە حیکمەتە ، وە بەهەمان شێوە هەموو وتەیەکی روون و ڕاشکاو و ڕاست لە خودی خۆیدا بریتی‌یە لە حیکمەت ، هەر بۆیە ئایەتە قورئانیەکان لەپێشترن بەوەی کە ناوبنرێن حیکمەت ، وە بەهەمان شێوە فەرموودە ڕاست و صەحیحەکانیش لەپێشترن بەوەی کە ناوبنرێن حیکمەت لە پاش کتێبەکەی خوا ، وە خوای گەورە لە کتێبە گەورەکەیدا فەرموودەکانی پێغەمبەری (ﷺ) بە حیکمەت ناوبردووە ، هەروەکو لە فەرمایشتی خوای گەورەدا هاتووە : ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ ١٢٩﴾ [البقرة] ، واتە : وە فێری قورئان و (حیکمەت)یشیان دەکات ، واتە : (سوننەت و فەرموودە) .

هـەروەها وەكـو فەرمایشـتی خـوای پـاك و بێگـەرد : ﴿يُؤۡتِي ٱلۡحِكۡمَةَ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُؤۡتَ ٱلۡحِكۡمَةَ فَقَدۡ أُوتِيَ خَيۡرٗا كَثِيرٗاۗ ٢٦٩﴾ [البقرة] ، واتە : خوای گەورە حیكمەت دەدات بـەو كەسـەی كـە خۆی ویستی لـێبێت ، وە هەركەسێكیش حیكمەتی پێبدرێت ئەوا خێرێكی زۆری پێدراوە .

بەڵگە ئاشـكرا و روونـەكان نـاودەنرێن حیكمـەت ، وە قسـەی روون و حـەق پێـك ناودەنرێـت حیكمــەت ، وە لــەو بابەتــەیش (الحَكَمة / لغاو) كـە دەخرێتـە نـاو دەمـی ئەسـپ بـەوە نـاونراوە چونكە دەبێتە ڕێگری ئەسپ لە بـەردەوام بـوونی لـە ڕۆیشـتن لـە كاتێكدا كە خاوەنەكەی بەو لغاوە (الحَكَمة)یە ڕایدەكێشێت .

كەواتـە (حیكمـەت) وشـەیەكە ئـەو كەسـەی كـە دەیبیسێت دەیگرێتەوە لە بەردەوام بوونی لەسەر باتڵ و ناحەق ، وە بـانگی

دەکات بۆ وەرگرتنی حەق و کاریگەربوون پێی و ڕاوەستان لە ئاست ئەو سنوورانەی کە خوای گەورە دایناون .

کەواتە پێویستە لەسەر کەسی بانگخواز بۆ لای خوای گەورە دەعوە و بانگەواز بکات بە حیکمەت ، وە بەمە دەست پێبکات و بایەخی پێبدات .

وە ئەگەر کەسی بانگەوازکراو هەندێك وشکی و ناڕێکی و پشتهەڵکردنی تێدا بوو ئەوا دەعوە و بانگەوازی دەکەیت بە ئامۆژگاری چاك بەو ئایەت و فەرموودانەی کەوا ئامۆژگاری و سەرنجڕاکێشان و هاندانی تێدایە .

وە ئەگەر کەسی بانگەوازکراو گومان و شوبهەی هەبوو ئەوا گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەیت و موناقەشەی دەکەیت بەوەی کە باشترە و قورسی ناکەیتەوە لەسەری ، بەڵکو صەبر و ئارامی لەسەر دەگریت و پەلە ناکەیت و توند نابیت ، بەڵکو تێدەکۆشیت و هەوڵ دەدەیت بۆ لابردنی گومان و شوبهەکەی و

ڕوونكردنەوەی بەڵگەكان بە ئسلوب و شێوازێكی باش و جوان ، ئەی كەسی بانگخواز پێویستە بەو شێوازە خۆڕاگربێت و صەبر و ئارامت هەبێت و تووند نەبیت ، چونكە ئەمە نزیكترە بۆ سوودوەرگرتن لە حەق و قەبوڵكردنی و كاریگەربوونی كەسی بانگەوازكراو و ئارامگرتنی لەسەر گفتوگۆ و موناقەشەكردن لەگەڵیدا ، وە خوای گەورە فەرمانی كردووە بە (موسى) و (هارون) ـ كاتێك كە هەردووكیانی نارد بۆ لای (فرعون) ــ بەوەی كەوا وتەیەكی نەرمی پێ بڵێن لە كاتێكدا كە (فرعون) لەڕۆدەرچووترین و لەسنووردەرچووترینی كەسە تاغوت و یاخی و لەسنووردەرچووەكان بوو ، خوای گەورە لە فەرمانەكەیدا بۆ (موسى) و (هارون) فەرموویەتی : ﴿فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ ٤٤﴾ [طه] .

واتە : هەردووكتان وتەیەكی نەرمی پێ بڵێن بەڵكو بیربكاتەوە یان لەخوا بترسێت .

**هەروەها خوای گەورە سەبارەت بە پێغەمبەرەكەی (مُحَمَّد** عليه الصلاة والسلام**) فەرموویەتی :** ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ ﴿١٥٩﴾ ﴾ [آل عمران] .

**واتە : تۆ بە ڕەحمەتێك لە خواوە نەرمیت بۆ نواندن ، وە ئەگەر تۆ كەسێكی وشك و قسە توند و ڕەوشت خراپ و دڵ ڕەق ببوایەیت ئەوا دووردەكەوتنەوە لە چواردەورت و وازیان لێت دەهێنا .**

**بەمەوە زانرا كەوا شێوازی دانایانە و ئسلوبی حەكیمانە و ڕێڕەوی ڕاست لە دەعوە و بانگەوازدا ئەوەیە كە دەبێت كەسی بانگخواز حەكیم و دانابێت لە دەعوەكردن و بانگەوازكردنەكەیدا ، وە بەرچاوڕۆشن بێت بە شێواز و ئسلوبەكانی ، نابێت پەلە بكات و ناشبێت توند و وشك و ڕەق بێت ، بەڵكو بە حیكمەتەوە دەعوە و بانگەواز دەكات كە بریتی‌یە لە وتەی ڕوون و حەق پێك لە ئایەتەكان و فەرموودەكان**

، هەروەها بە ئامۆژگاری چاك و گفتوگۆ و موناقشە لەگەڵدا کـردن بەوەی کە چاکترە .

ئا ئەمە ئەو شێواز و ئسلوبەیە کـە پێویسـتە لەسـەری بیـت و پیادەی بکەیت لە دەعـوە و بانگـەوازکردندا بۆ لای خوای گـەورە ، بەڵام دەعـوە و بانگـەوازکردن بە جەهل و نەزانیەوە ئەوا زەرەر و زیان دەگەیەنێت و سوودی نیـیە هەروەکو چۆن ڕوونکردنـەوەی ئەمە دێت لە کاتی باسکردنی ڕەوشتی بانگخوازاندا ـ إن شاء الله ـ ، چـونکە بەڕاسـتی دەعـــوە و بانگـــەوازکردن لەگـەڵ هـەبوونی جەهل و نەزانی بە بەڵگەکان ئەمە قسەکردنە بە ناوی خواوە بەبێ علـــم و زانســـت ، هـــەروەها بانگـــەوازکردنیش بـــە وشـــکی و توندوتیژی زەرەر و زیانی زیاترە ، بەڵکو ئەوە واجب و پێویست و شەرعیـیە کە ئەو شێواز و ئسلوبە وەربگریت و پـەیڕەو بکـەیت کـە خـوای گـەورە لـە سـورەتی (النحل)دا ڕوونـی کردووەتـەوە و بریتیـیە لـە فەرمایشـتی خـوای پـاك و بێگـەرد : ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ

رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴿١٢٥﴾ [النحل] .

واتــە : بانگــەواز بکـە بـۆ لای ڕێگــای خـوا بـە حیکمـەت و ئامۆژگـاری چـاك و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکە بەوەی کە چاکترە .

ئـیللا مەگـەر لـە کەسـی بانگـەوازکراوەوە ملـهوڕی و زوڵـم و ستەم دەربکەوێت ئەو کاتە ڕێگری ناکرێـت لـەوەی کـە لەگەڵیـدا توونـدبیت هەروەکو چۆن خوای پاك و بێگـەرد فەرموویـەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٧٣﴾ ﴾ [التوبة] .

واتە : ئەی پێغەمبەر جیهادی بێباوەڕەکان و دووڕووەکان بکە و توونـدبـە لەگەڵیانـدا ، وە ئەوانــە جێیــان دۆزەخ و خــراپترین دەرئەنجامە .

هـــەروەها خـــوای گـــەورە فەرموويـــەتی : ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ ﴿٤٦﴾﴾ [العنكبوت] .

واتــە : گفتوگـۆ و موجادەلــە مەکــەن لەگــەڵ ئــەهلی کیتابـدا (جوولەکە و گاورەکان) ئیللا بەوە نەبێت کە چاکترە مەگەر تەنها ئەوانەیان نەبێت کە زوڵم و ستەمیان کردووە .

## بواری سێیەم

## ڕوونکردنەوەی ئەو شتەی کە بانگەوازی بۆ لا دەکرێت

وە ئەو شتەی کە بانگەوازی بۆ لا دەکرێت و واجب و پێویستە لەسەر بانگخوازان روونی بکەنەوە بۆ خەڵك هەروەکو چۆن پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) روونیان کردووەتەوە ئا ئەوە دەعوە و بانگەوازە بۆ لای ڕێگای ڕاستی خوا ، وە ئەوە ئیسلامە و ئەوە ئاینی حەقی خوایە ، ئا ئەمە جێی دەعوە و بانگەوازکردنە ، ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ ... ﴿١٢٥﴾ ﴾ [النحل] ، واتە : بانگەواز بکە بۆ لای ڕێگای خوا .

وە ڕێگای خوای گەورەیش بریتی‌یە لە ئیسلام و لە ڕێگای ڕاست و لەو ئاینەی خوا کە پێغەمبەر (مُحَمَّد)ی پێناردووە (عليه الصلاة والسلام) ، ئا ئەمە واجب و پێویستە دەعوە و بانگەوازی بۆ لا بکرێت ، نەك بۆ لای مەزهەبی فلان و بۆ لای ڕاوبۆچوونی فلان ، بەڵکو پێویستە دەعوە و بانگەواز بکرێت بۆ لای ئاینی خوا و بۆ

لای ڕێگای ڕاستی خوا کە خوا پێغەمبەر و هەرەخۆشەویستی خۆی (مُحَمَّد)ی پێناردووە (عليه الصلاة والسلام) ، کە ئەویش بریتی‌یە لەوەی کە قورئانی گەورە و سوننەتی پاککراوە و سەلمێنراو لە پێغەمبەری خواوە (عليه الصلاة والسلام) بەڵگەیە لەسەری ، وە لەسەرووی هەموو ئەوانەوە دەعوە و بانگەوازکردن بۆ لای عەقیدە و بیروباوەڕی ڕاست و درووست ، بۆ لای ئیخلاص و نیازپاکی بۆ خوا و یەکتاکردنەوەی خوا بە عیبادەت و پەرستن ، هەروەها بۆ لای باوەڕهێنان بە خوا و پێغەمبەرانی و باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی و بە هەموو ئەوانەیش کە خوا و پێغەمبەرەکەی هەواڵیان پێیداوە ، ئا ئەمە بنچینە و بنەمای ڕێگای ڕاستە ، کە بریتی‌یە لە دەعوە و بانگەوازکردن بۆ لای شایەتیدان بەوەی کەوا هیچ پەرستراوێکی حەق نی‌یە کە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا و (مُحَمَّد)یش پێغەمبەری خوایە .

واتای ئەمەیش بریتییە لە دەعوە و بانگەوازکردن بۆ لای یەکخواپەرستی و ئیخلاص و نیازپاکی بۆ خوا و باوەڕهێنان بە خوا و بە پێغەمبەرانی (عليهم الصلاة والسلام) ، وە لەوەیش کە دەچێتە ناو ئەمەوە و بەشێکە لەم بانگەوازکردنە بۆ باوەڕهێنان بە هەموو ئەوانەی کە خوا و پێغەمبەرانی هەواڵیان پێیداوە لەوەی کە پێشتر ڕوویداوە و ئەوەیش کە ڕوودەدات لە بارەی دواڕۆژ و لە بارەی کۆتایی ژیان و جگە لەوەیش ، هەروەها لەوەیش کە دەچێتە ناو ئەمەوە بانگەوازکردنە بۆ لای ئەوەی کە خوا واجب و پێویستی کردووە لە بەجێهێنانی نوێژ و زەکاتدان و ڕۆژووگرتنی ڕەمەزان و حەج کردنی ماڵی خوا و جگە لەوانەیش ، هەروەها لەوەیش کە دەچێتە ناو ئەمەوە بانگەوازکردنە بۆ لای جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوا و فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە و وەرگرتنی ئەوەیش کە خوا شەرعیەتی پێداوە لە پاك وخاوێنی و نوێژکردن و مامەڵەکردنەکان و ژنهێنان و

شووکردن و تەڵاقدان و تاوانەکان و خەرجیەکان و جەنگ و ئاشتی و سەبارەت بە هەموو شتێك ، چونکە ئاینی خوای گەورە ئاینێکی گشتگیر و هەمەلایەنە و بەرژەوەندیەکانی عەبدەکان لە ژیانی دونیا و دوارۆژیش دەگرێتەوە ، وە هەموو ئەوانەیش دەگرێتەوەکە خەڵکی پێویستی پێیان هەیە لە بواری دین و ئاینەکەیان .

وە بانگەشەیش دەکات بۆ لای ڕەوشتە پیرۆزەکان و کردەوە باش و جوانەکان ، وە نەهی و ڕێگریش دەکات لە ڕەوشتە سووك و ڕیسواکان و کردەوە خراپەکان .

ئەم ئاینە بریتی‌یە لە عیبادەتکردن و سەرکردایەتی‌کردنیش : موسڵمان خواپەرستی دەکات و سەرکردایەتی سوپایش دەکات .

هەروەها عیبادەتکردن و فەرمانڕەوایەتی‌کردنیشە : موسڵمان خواپەرست و نوێژگەر و ڕۆژووگرە و فەرمانڕەوایەتیش دەکات بە شەرعی خوا و ئەحکام و بڕیارەکانی خوای گەورە جێبەجێ دەکات .

هەروەها عیبادەتکردن و جیهادکردنیشە : موسڵمان دەعوە و بانگەواز دەکات بۆ لای خوا و لە پێناوی خوایشدا جیهادی ئەو کەسانە دەکات کە لە دین و ئاینی خوا دەرچوونەتە دەرەوە .

هەروەها قورئان و شمشێریشە : موسڵمان تێڕامان و تێفکران دەکات لە قورئان و ئەحکام و بڕیارەکانیشی بەهێز جێبەجێ دەکات ئەگەر بە شمشێریش بێت ئەگەر پێویستی بەوە کرد .

هەروەها سیاسەت و کۆمەڵناسیشە : بانگەشە دەکات بۆ لای ڕەوشتە باشەکان و برایەتی ئیماندارانە و کۆکردنەوەی نێوان موسڵمانان و یەکخستنی نێوانیشیان ، هەروەکو چۆن خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ ﴿١٠٣﴾ ﴾ [آل عمران] ، واتە : هەمووتان دەست بگرن بە دین و بەرنامەی خواوە و پارچەپارچە و پەرتەوازەیش مەبن .

هەر بۆیە ئاینی خوا بانگەشە دەکات بۆ لای کۆبوون و بۆ لای سیاسەتی چاك و دانایانەیش کە خەڵك کۆبکاتەوە و پەرتەوازەیان

نەکات ، خەڵکی یەکبخات و دووریان نەخاتەوە لەیەکتر ، بانگەشە دەکات بۆ لای دڵ سافی و ڕێزگرتنی برایەتی موسڵمانانە و یارمەتیدان و هاوکاری کردنی یەکتر لەسەر چاکە و خۆپاراستن لە تاوان و دڵسۆزی و دڵ پاکی دەربڕین بۆ خوا و بۆ عەبدەکانیشی ، هەروەها بانگەشەیش دەکات بۆ لای دانەوەی ئەمانەت و فەرمانڕەوایەتی کردن بە شەریعەت و وازهێنان لە فەرمانڕەوایەتی کردن بە جگە لەوەی کە خوا دایبەزاندووە هەروەکو چۆن خوای پاك و بێگەرد فەرموویەتی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ ﴿٥٨﴾ ﴾ [النساء] .

واتە : بەڕاستی خوا فەرمانتان پێدەکات بە دانەوەی ئەمانەتەکان و گێڕانەوەیان بۆ خاوەنەکانیان ، وە بەوەیش کە ئەگەر حوکم و دادوەریتان کرد لە نێوان خەڵکدا ئەوا بە عەدل و دادوەرانە حوکم بکەن .

هەروەها ئەم ئاینە سیاسەت و ئابووریشە هەروەکو چۆن سیاسەت و عیبادەت و جیهادە : ئەم ئاینە بانگەشە دەکات بۆ ئابووریەکی شەرعی میانگیر نە سەرمایەداریەکی زۆر ستەمکارانە و زاڵمانەیە کە گوێ بە حەرامکراوەکان نادات و پارە و ماڵ و سامان کۆدەکاتەوە بە هەموو وەسیلە و هەموو ڕێگایەك ، وە نە ئابووریەکی شیوعیانەی ئیلحادی و بێباوەڕانەیشە کە ڕێز و حورمەت بۆ ماڵ و سامانی خەڵك دانانێت و گوێیش نادات بە فشارخستنەسەریان و زوڵم و ستەم لێکردن و دەستدرێژی کردنەسەریان ، نە ئەمەیە و نە ئەوەیشە ، بەڵکو ئابووری ئیسلامی نێوەندگیرە لە نێوان هەردوو ئابووری سەرمایەداری و ئابووری شیوعی و شۆسیالستی ، وە نێوەندگیرە لە نێوان هەردوو ڕێبازەکە و حەق و ڕاستییە لە نێوان دوو ناحەق و باتڵ ، ڕۆژئاوا پارە و ماڵیان گەورەڕاگرتووە و زیادەڕەویان کردووە لە خۆشویستنی و کۆکردنەوەیدا تا ئەو ئاستەی کەوا بە هەموو وەسیلە و ڕێگایەك کۆیدەکەنەوە و لەو پێناوەدا ئەوەی کە خوای گەورە حەرام و قەدەغەی کردووە دەگرنەبەر ، وە ڕۆژهەڵاتیش

لــە مولحیــد و بێباوەڕەکــان لــە ســۆڤێت (روســیای ئێســتا) و ئەوانەیش کە ڕێڕەوەکەی ئەوانیان گرتووەتەبەر ڕێز و حورمەت بۆ ماڵ و سامانی عەبدەکان دانانێن بەڵکو دەیبەن و بۆ خۆیانی حەڵاڵ دەکەن ، وە گوێ بەوەیش نادەن کە لەو بوارەدا چیان کردووە ، بەڵکو عەبدەکانی خوایان کرد بە کۆیلە و عەبدی خۆیان ، وە گەل و میللەتەکانیشیان چەوساندووەتەوە ، وە کوفریان کرد و بێباوەڕبوون بە خوا و ئینکاری دین و ئاینەکانیان کرد ، هەروەها وتیان : هیچ خوایەك نی‌یە و ژیان تەنها مادەیە ، هیچ گوێیان نەدا بەم پارە و ماڵ و سامانە و گوێیشیان نەدا بە بردنی بەبێ ئەوەی کە ڕەوا و حەڵاڵ بێت بۆیان ، وە گوێیشیان نەدا بە ڕێگا و وەسیلەکانی لەناوبردن و دەستگرتن بەسەر ماڵ و سامانەکان و بوونە بەربەست لە نێوان خەڵك و نێوان ئەوەی کە خوا ڕایهێناوون لەسەری لە کاسبی کردن و سوودوەرگرتن و سوودبینین لە تواناکانیان و لە عەقڵ و ژیریەکانیان و ئەوەیش کە خوا پێیداون لە کەرەستە و ئامرازەکان ، نە ئەمە و نە

ئەوەیشیان ، بەڵکو ئیسلام هاتووە بە پاراستنی ماڵ و سامان و دەستخستنی بە ڕێگا شەرعیە دوورەکان لە زوڵم و ستەمکردن و غەش و فێڵ کردن و ریباخواردن و زوڵمکردن لە خەڵك و دەستدرێژی کردنە سەریان ، هەروەها ئیسلام هاتووە بە ڕێزگرتن لە موڵکی تاکە کەسی و موڵکی کۆمەڵە کەسیش ، بۆیە ئیسلام نێوەندگیرە لە نێوان دوو سیستەم و لە نێوان دوو ئابووری و لە نێوان دوو ڕێگای زۆر زاڵم و ستەمکارانە ، ئیسلام ماڵ و سامانی حەلاڵ کردووە و بانگەشەی بۆ کردووە و بانگەشەی کردووە بۆ دەستخستنی بە ڕێگا حەکیم و داناییەکان ، ئەمە بەبێ ئەوەی کە کەسە بەدەستخەرەکەی سەرقاڵ بکات لە تاعەتی خوا و پێغەمبەرەکەی و لە بەجێهێنانی ئەوەی کە خوا پێویست و فەرزی کردووە لەسەری ، لەبەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ ﴿٢٩﴾ ﴾

[النساء] ، واتە : ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ماڵ و سامانتان لە نێوان یەکتردا بە ناحەق و باتڵ مەخۆن .

**وە پێغەمبەر** (عليه الصلاة والسلام) **فەرموویەتی :** ((كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ))[1].

**واتە : هەموو موسڵمانێك خوێن و ماڵ و شەرەف و ناموسی حەرامە لە سەر موسڵمان .**

**هەروەها فەرموویەتی :** ((أَلَا إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا))[2].

**واتە : بزانن کە بەڕاستی خوێنتان و ماڵتان و ناموستان حەرامن لەسەر یەکتر وەکو حورمەتی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگەتان لەم وڵاتەتان .**

**هەروەها پێغەمبەر** (عليه الصلاة والسلام) **فەرموویەتی :** ((لَأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ فَيَأْتِيَ بِحُزْمَةِ الْحَطَبِ عَلَى ظَهْرِهِ فَيَبِيعَهَا فَيَكُفَّ اللَّهُ بِهَا وَجْهَهُ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ النَّاسَ أَعْطَوْهُ أَوْ مَنَعُوهُ))[1].

---

[1] صحيح مسلم رقم : (٢٥٦٤) .

[2] صحيح البخاري رقم : (٦٧) ، وصحيح مسلم رقم : (١٨٥٠) .

[1] صحيح البخاري رقم : (١٤٧١) ، وصحيح مسلم رقم : (١٠٤٢) .

واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە پەتەکەی ببات و لەسەر پشتی باوەشە چیلکەدار بێنێت و بیفرۆشێت و بەوە خوا ڕوومەتی بگرێتەوە لە ئابڕوچوونی دونیا و سزای دواڕۆژ ئەوە باشترە بۆی لەوەی کە داوای خێر و یارمەتی لە خەڵك بکات چ پێ‌ی‌بدەن یان لێی بگرنەوە .

وە پرسیارکراوە لە پێغەمبەر (ﷺ) : ((أَيُّ الْكَسْبِ أَطْيَبُ)) ؟

واتە : ئایا کام کاسبی‌یە پاکتر و حەڵاڵترە ؟

فەرمووی : ((عَمَلُ الرَّجُلِ بِيَدِهِ ، وَكُلُّ بَيْعٍ مَبْرُورٍ))[٢].

واتە : بەرهەمی ئیش و کاری پیاو بە دەستی خۆی ، وە هەموو کڕین و فرۆشتنێکی پاك و بێ‌غەش و خیانەت و درۆکردن .

هەروەها پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی : ((مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَامًا قَطُّ خَيْرًا مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ ، وَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَام كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ))[١].

---

[٢] مسند الإمام أحمد : (٤ / ١٤١) .

[١] صحيح البخاري رقم : (١٤٧١) ، وصحيح مسلم رقم : (١٠٤٢) .

واتە : هیچ کەسێك نی‌یە هەرگیز خواردنێکی خواردبێت باشتر بێت لەوەی کەوا بەرهەمی ئیش و کاری دەستی خۆی بێت ، وە پێغەمبەری خوا (دَاوُد عَلَيْهِ السَّلَام) لە بەرهەمی ئیش و کاری دەستی خۆیی دەخوارد .

ئەمە ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کەوا سیستەمی ئیسلام لە بواری ماڵ و ساماندا سیستەمێکی نێوەندگیرە ، نە لەگەڵ سەرمایەداری زۆر ستەمکار لە ڕۆژئاوا و شوێنکەوتووانیدایە ، وە نە لەگەڵ شیوعی‌یە مولحید و بێباوەڕەکانیشدایە کە ماڵ و سامانەکانیان بۆ خۆیان حەڵاڵ کردووە و خاوەنەکانیشیان لەناوبردووە و هیچ بایەخیان پێنەداوون و گەل و میلەتانیان کردووە بە کۆیلەی خۆیان و لەناویان بردوون و ئەوەی کە خوا حەرامی کردووە لە ماڵ و سامانەکان ئەوان حەڵاڵیان کردووە ، بەڵام لە ئیسلامدا تۆ بۆت هەیە ماڵ و سامان بەدەست بخەیت و بە ڕێگا شەرعیەکان بەدوایدا بگەڕێیت ، وە تۆ خۆت لەپێشتریت

بە ماڵ و سامانی خۆت و ئەوەی کە بەدەستتخستووە بەو ڕێگایەی کە خوای گەورە شەرعیەتی پێداوە و حەڵاڵی کردووە .

هەروەرها ئیسلام بانگەشە دەکات بۆ برایەتی ئیمانی ، وە بۆ دڵپاکی و دڵسۆزی دەربڕین بۆ خوا و بۆ عەبدەکانیشی ، وە بۆ ڕێزگرتنی موسڵمان لە براکەی ، نە کینەلەدڵبوون و نە حەسوودی پێبردن و نە غەش لێکردن و نە ناپاکی و خیانەت لێکردن و نە جگە لەوانەیش لە ڕەوشتە زەمکراوەکانی هەبێت هەروەکو چۆن خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ ﴿٧١﴾ ﴾ [التوبة] .

واتە : وە پیاوانی ئیماندار و ئافرەتانی ئیماندار هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکی تریانن .

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ ﴿١٠﴾ ﴾ [الحجرات] .

واتە : بەڕاستی تەنها ئیمانداران برای یەکترن .

هـــەروەها پێغەمبـــەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموویـــەتی : ((الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ ، لاَ يَظْلِمُهُ ، وَلاَ يَخْذُلُهُ ، وَلاَ يَحْقِرُهُ))[١].

واتە : موسڵمان برای موسڵمانە ستەم و زوڵمی لێناکات ، وە سەرشۆڕی ناکات ، وە بە چاوی سووك و کەم ڕێزیەوە سەیری ناکات .

موسڵمان برای موسڵمانە و پێویستە لەسەری ڕێزی لێبگرێت و بە چاوی سووك و کەم ڕێزیەوە سەیری نەکات ، وە لەسەریشی پێویستە بەویژدان بێت لەگەڵیدا و لە هەموو ڕوویەکیشەوە کە خوای گەورە شەرعیەتی پێداوە حەق و مافی بدات .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((الْمُؤْمِنُ مَرْآةُ أَخِيهِ الْمُؤْمِنِ))[٢] ، واتە : ئیماندار ئاوێنەی برای ئیمانداریەتی .

---

[١] صحيح البخاري رقم : (٢٤٤٢) ، وصحيح مسلم رقم : (٢٥٨٠) .

کەواتە برام تۆ ئاوێنەی برا ئیماندارەکەتی ، وە تۆ خشتێکیت لەو بینایەی کەوا بینای برایەتی ئیمانی لەسەر ڕاوەستاوە ، هەر بۆیە لەخوابترسە لە ئاست حەق و مافی براکەتدا و حەق و مافی بزانە و بە حەق و دڵسۆزی و ڕاستگۆیەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکە .

وە پێویستە لەسەرت کەوا هەموو ئیسلام وەربگریت نەوەك لایەکی وەربگریت و لایەکی تری وەرنەگریت ، عەقیدە و بیروباوەڕ وەرمەگرە و وازبێنیت لە ئەحکامەکان و کردەوەکان ، هەروەها ئەحکامەکان و کردەوەکانیش وەرمەگرە و وازبێنیت لە عەقیدە و بیروباوەڕ ، بەڵکو هەموو ئیسلام وەربگرە ، ئیسلام وەربگرە وەکو بیروباوەڕ و کردەوە و عیبادەت و جیهاد و کۆمەڵناسی و سیاسەت و ئابووری و جگە لەوانەیش ، لە هەموو رووەکانەوە ئیسلام وەربگرە ، هەروەکو چۆن خوای پاك و بێگەرد

(٢) سنن أبي داود رقم : (٤٢٧٢) .

فەرموویـــــەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٠٨﴾ ﴾ [البقرة] .

واتــە : ئـەی ئـەو کەسـانەی کـە باوەڕتـان هێنـاوە بڕۆنـە نـاو ئیسـلامەوە هـەر هـەمووی ، وە شـوێنی هـەنگاوەکانی شـەیتان مەکەون چونکە ئەو دوژمنێکی روون و ئاشکرای ئێوەیە .

کۆمەڵانێك لە سـەلەف فەرموویانـە واتـای ئـەوە : (ادخلوا في السِّلْمِ جميعه يعني في الإسلام) واتــە : بڕۆنـە نـاو ئیسـلامەوە هـەر هـەمووی ، بـە ئیسـلام دەوترێـت (السِّلْم) چـونکە ئیسـلام ڕێگـای سەلامەتـیـیە ، وە ڕێگای ڕزگاربوونە لـە دونیـا و دواڕۆژ ، ئیسـلام سەلامەتی و ملکەچیـیە .

ئـاینی ئیسـلام بانگەشـە دەکـات بـۆ ئاشـتی و سـەلامەتـی ، بانگەشە دەکات بۆ ڕاگرتنی خوێن ڕشـتن بـەوەی کـە شـەرعیەتی پێـداوە لــە سـزا دیاریکراوەکـان (الحدود) و تۆڵەکردنـەوەکان

(القصاص) و جیهادی شەرعی ڕاستگۆیانە ، ئاینی ئیسلام سەلامەتی و ملکەچی و ئارامی و ئەمان و ئیمانە ، وە لەبەر ئەمە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ﴾ واتە : بڕۆنە ناو ئیسلامەوە هەر هەمووی ، واتە بڕۆنە ناو هەموو لق و بەشەکانی ئیمانەوە و هەندێکی وەرنەگرن و وازلەهەندێکی تری بێنن ، پێویستە لەسەرتان هەموو ئیسلام وەربگرن ، ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ﴾ (وە شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون) واتە : ئەو سەرپێچی و تاوان و گوناهانەی کە خوای گەورە حەرامی کردوون ، چونکە بەڕاستی شەیتان بانگەشە دەکات بۆ تاوان و گوناهەکان و بۆ وازهێنان لە دین و ئاینی خوا هەر هەمووی ، شەیتان دوژمنترینی دوژمنەکانە .

وە لەبەر ئەمە پێویستە لەسەر موسڵمان کەوا دەست بگرێت بە هەموو ئیسلامەوە ، وە دینداری بکات بە هەموو ئیسلامەوە ، وە دەست بگرێت بە پەتی خوای گەورەوە ، وە وریابێت لە

هۆکارەکانی پەرتەوازەبوون و جیاوازی و ناکۆکی لە هەموو بارودۆخەکاندا ، پێویستە لەسەرت حوکم بە شەرعی خوا بکەیت لە پەرستشەکان (العبادات) و مامەڵەکانیش (المعاملات) ، وە لە ژنهێنان و شوکردن و تەڵاقدانیش (النكاح والطلاق) ، وە لە نەفەقات و خەرجیەکانیش (النفقات) ، وە لە شیرخواردن و شیرپێدانیش (الرضاع) ، وە لە ئاشتی و جەنگیشدا (السِّلم والحَرب) ، وە لەگەڵ دوژمن و هاوڕێیشدا (العدو والصديق) ، وە لە تاوانەکان (الجِنايات) و هەموو شتەکانی تریشدا ، پێویستە حوکم بە ئاینی خوا بکرێت لە هەموو شتەکاندا .

وە وریابە لەوەی کە دۆستایەتی و پشتیوانی براکەت بکەیت لەبەر ئەوەی کە لە فلانە شتدا هاوڕایە لەگەڵ تۆ و دەگونجێت لەگەڵ تۆدا ، وە دژایەتی ئەوی تر بکەیت لەبەر ئەوەی کە پێچەوانەی تۆیە لە ڕاوبۆچوونێکدا یان لە پرس و بابەتێکدا ، ئەمە ئینصاف و ویژدان نییە ، صەحابەکان (رضي الله عنهم) لە چەندین

پــرس و بابەتــدا جیــاوازی هــەبووە لــە نێوانیــان ، وە لەگــەڵ ئەوەیشدا ئەوە كاریگەری نەكردووەتە سەر دڵپاكی و دۆستایەتی و خۆشەویستی نێوانیان (رضي الله عنهم وأرضاهم) .

كەواتە ئیماندار كار دەكات بە شـەرعی خـوا ، وە دینـداریش دەكـات بـە حـەق ، وە ئـەوەیش پـێش دەخـات بەســەر هـەموو كەسێكەوە بە بەڵگەوە ، بەڵام ئەوە هەڵینانێت بـۆ زوڵـم و سـتەم كـردن لــە براكــەی و بــە ویــژدان نــەبوون لەگەڵیــدا ئەگــەر لــە ڕاوبۆچووندا پێچەوانەی ئەمی كرد لەو پرس و بابەتانەدا كە جێی ئیجتیهاد تێدا كـردنن (مسائل الاجتهاد) ئـەوەی كـە هەنـدێك جـار بەڵگــەكانیان شــاراوەن ، وە بەهــەمان شــێوە لــەو پــرس و بابەتانەشـدا كـە زانایـان دەكەونـە جیاوازیـەوە لـە لێكدانـەوەی دەقەكەدا ، چونكە ئەو كەسـە هەنـدێك جار عـوزر و بیـانووی بـۆ دەهێنرێتەوە ، بۆیە پێویستە لەسەر تۆ كەوا ئامۆژگاری بكەیت و خێـرت پـێخۆش بێـت بـۆی ، وە ئـەوە هەڵتنـەنێت بـۆ دژایـەتی

کردنی و لەتبوون و لێکترازان و دەرفەتدان بە دوژمن کەوا زاڵ ببێت بەسەر تۆ و بەسەر براکەتیشدا ، (وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ) .

ئیسلام ئاینی عەدالەت و دادوەرییە ، ئاینی حوکم و فەرمانڕەوایی کردنە بە حەق و چاکەکاری ، ئاینی یەکسانییە تەنها لەو شتانەدا نەبێت کە خوای گەورە لەمە بەدەری کردوون ، ئەم ئاینە بانگەشەکردنی تێدایە بۆ هەموو خێر و چاکەیەك ، وە بانگەشەکردنی تێدایە بۆ ڕەوشتە پیرۆزەکان و کردەوە باش و جوانەکان و بەویژدان بوون و عەدالەت و دادوەری و دووربوون لە هەموو ڕەوشتێکی سەرزەنشتکراو و خراپ ، خوای بەرز و پایەدار فەرموویەتی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾﴾ [النحل] ، واتە : بەڕاستی خوا فەرمان دەکات بە دادپەروەری و چاکەکاری و بەخشینی ماڵ بە خزمانی نزیك و

ڕێگریش دەکات لە خراپەکاری و تاوان و ستەم کردن ، بەمە ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی بیربکەنەوە .

هەروەها خوای بەرز و پایەدار فەرموویەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣ ﴾ [الحجرات] .

واتە : ئەی خەڵکینە بەڕاستی ئێمە ئێوەمان لە نێرینە و مێیینەیەك دروست کردووە و ئێوەمان کردووە بە چەندین گەل و هۆز (میللەت و عەشیرەت) بۆ ئەوەی یەکتر بناسنەوە ، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا لەخواترسترینتانە ، بەڕاستی خوا زانا و زۆرشارەزایە .

**بە کورت و پوختی** : ئەوەی کە پێویستە لەسەر بانگخوازی ئیسلامی ئەوەیە کە دەعوە و بانگەواز بکات بۆ هەر هەموو ئیسلام و جیاوازی و پەرتەوازەیی نەخاتە نێوان خەڵکەوە ، وە

نابێت دەمارگیر بێت بۆ مەزهەبێك بەدەر لە مەزهەبێکی تر ، یان بۆ عەشیرەت و هۆزێك بەدەر لە عەشیرەت و هۆزێکی تر ، یان بۆ مامۆستاکەی یان بۆ سەرۆکەکەی یان بۆ جگە لەوانە ، بەڵکو واجب و پێویست ئەوەیە کە مەبەست و ئامانجی بریتی بێت لە جێگیرکردنی حەق و روونکردنەوەی و بەردەوام بوون و ڕێك ڕۆیشتنی خەڵك لەسەری ئەگەر چی ئەمە پێچەوانەی ڕاوبۆچوونی فلاّن یان فلاّن یان فلاّنیش بێت .

وە کاتێك کە لە ناو خەڵکدا هەندێك کەس پێگەیشت لەسەر دەمارگیری بۆ مەزهەبەکان و دەیوت : مەزهەبی فلاّن لەپێشترە لە مەزهەبی فلاّن .. ئەو کاتە پەرتەوازەبوون و جیاوازی هات و سەریهەڵدا ، تاوەکو ئەمە هەندێك لە خەڵکی گەیاندە ئەوەی کەوا نوێژ نەکات لەگەڵ ئەو کەسەی کە لەسەر مەزهەبەکەی ئەو نییە ، بۆیە شافعی مەزهەب لە پشت حەنەفی مەزهەبەوە نوێژی نەدەکرد ، وە حەنەفی مەزهەبیش لە پشت مالکی مەزهەب و

حەنبەلی مەزهەبەوە نوێژی نەدەکرد ، ئا ئەوە ڕوویدا لە هەندێك لە زیادەڕەوە دەمارگیرەکانەوە ، وە ئەمەیش بەشێکە لە بەلاّ و بەشێکە لە شوێنکەوتنی هەنگاوەکانی شەیتان ، چونکە بەڕاستی پێشەوایان پێشەوایانی هیدایەتدان و ڕێپیشاندان شافعی و مالك و ئەحمەد و ئەبوحەنیفە و ئەوزاعی و ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی و هاوشێوەکانیان هەموویان پێشەوایانی هیدایەتدان و ڕێپیشاندان و بانگخوازانی حەق بوون ، دەعوە و بانگەوازی خەڵکیان کردووە بۆ لای دین و ئاینەکەی خوا و ڕێنماییان کردوون بۆ لای حەق ، وە هەندێك پرس و بابەت کەوتووەتە نێوانیانەوە کە تێیاندا جیاواز بوون و هاوڕانەبوون لەبەر شاراوەیەتی بەڵگە بە لای هەندێکیانەوە ، کەواتە ئەوان لە نێوان هەوڵدەرێکی ڕاست پێکاودا (مُجتهد مُصيب) بوون کە دوو ئەجر و پاداشتی بۆ هەیە ، وە یان هەوڵدەرێکە و حەقی نەپێکاوە (مُجتهد أخطأَ الحق) ئەوەیش یەك ئەجر و پاداشتی بۆ هەیە ، بۆیە پێویستە لەسەر تۆ کەوا پلە و

پێگە و فەزڵ و چاکەیان بزانیت و داوای ئەوە بکەیت کە خوا ڕەحمیان پێبکات ، وە ئەوەیش بزانیت کەوا ئەوان پێشەوایانی ئیسلام و بانگخوازانی هیدایەتدان و ڕێپیشاندان بوون ، بەڵام ناشبێت ئەمە هەڵتبنێت بۆ دەمارگیری و تەقلید و لاسایی کردنەوەی کوێرانە و بڵێیت : لە هەموو حاڵەتێکدا مەزهەبی فلان لەپێشتر و نزیکترە لە حەقەوە ، یان بڵێیت : لە هەموو حاڵەتێکدا مەزهەبی فلان لەپێشتر و

نزیکترە لە حەقەوە و هەڵە ناکات ، نەخێر ، ئەمە هەڵەیە .

پێویستە لەسەرت کەوا حەق وەربگریت و شوێنی حەق بکەویت ئەگەر بەڵگەکەیت بۆ دەرکەوت ئەگەر چی پێچەوانەی فلانیش بێت ، وە پێویستیشە لەسەرت کەوا دەمارگیر نەبیت و تەقلید و لاسایی کوێرانە نەکەیت ، بەڵکو دەبێت فەزڵ و چاکە و پلە و پێگەی پێشەوایان بزانیت ، وە لەگەڵ ئەوەیشدا خۆپاریزی بکەیت بۆ خۆت و بۆ دین و ئاینەکەشت ، حەق وەردەگریت و

پێی ڕازی دەبیت ، وە ڕێنماییشی بۆ دەکەیت ئەگەر داوات لێکرا ، وە لە خوای گەورە دەترسیت و هەست بە چاودێریشی دەکەیت ، وە بە ویژدان دەبیت لەگەڵ خودی خۆتدا لەگەڵ باوەڕبوونت بەوەی کەوا حەق یەکە و بەوەیش کەوا زانا موجتەهیدەکان ئەگەر پێکایان ئەوا دوو ئەجر و پاداشتیان بۆ هەیە ، وە ئەگەر هەڵەشیان کرد و نەیانپێکا ئەوا تەنها یەك ئەجر و پاداشتیان بۆ هەیە ـ مەبەستم موجتەهیدەکانی ئەهلی سوننەیە کە ئەهلی علم و ئیمان و هیدایەتن ـ هەروەکو چۆن فەرموودەی صەحیح سەبارەت بەوە هاتووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) .

## مەبەست و ئامانج لە دەعوە و بانگەوازکردن

وە سەبارەت بە مەبەست و ئامانج لە دەعوە و بانگەوازکردن ئەوا مەبەست و ئامانج لەوە بریتی‌یە لە دەرهێنانی خەڵك لە تاریکاییەکانەوە بۆ ڕووناکی ، وە ڕێنمایی کردنیان بۆ لای حەق بۆ ئەوەی وەری بگرن و ڕزگاریان بێت لە ئاگر و ڕزگاریان بێت لە تورەیی خوا ، هەروەها مەبەست و ئامانج لە دەعوە و بانگەوازکردن بریتی‌یە لە دەرهێنانی کەسی کافر و بێباوەڕ لە تاریکی کوفر و بێباوەڕیەوە بۆ ڕووناکی و هیدایەت و بەرچاوروونی ، وە دەرهێنانی کەسی جاهیل و نەزان لە تاریکی جەهل و نەزانیەوە بۆ ڕووناکی علم و زانست ، وە دەرهێنانی کەسی تاوانبار و گوناهکار لە تاریکی سەرپێچی و تاوان کردنەوە بۆ ڕووناکی گوێڕایەڵی و تاعەت ، ئا ئەمەیە مەبەست لە دەعوە و بانگەوازکردن ، هەروەکو چۆن خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۖ ﴿٢٥٧﴾ [البقرة] ، واته :

خوا دۆست و پشتیوانی ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان هێناوە و لە تاریکاییەکانەوە دەریان دەهێنێت بۆ ڕووناکی .

پێغەمبەران نێردراون بۆ ئەوەی کە خەڵکی لە تاریکاییەکانەوە دەربهێنن بۆ ناو ڕووناکی ، وە بە هەمان شێوە بانگخوازانی حەقیش هەڵدەسن بە دەعوە و بانگەوازکردن و چالاك دەبن بۆی بۆ ئەوەی کە خەڵکی لە تاریکاییەکانەوە دەربهێنن بۆ ناو ڕووناکی، وە بۆ ڕزگارکردنیان لە ئاگر و لە گوێڕایەڵی شەیتان ، وە بۆ ڕزگارکردنیان لە گوێڕایەڵی هەواوئارەزوو بۆ گوێڕایەڵی کردنی خوا و پێغەمبەرەکەی .

## بواری چوارەم

## ڕوونکردنەوەی ئەو ڕەوشت و سیفەتانەی کە پێویستە بانگخوازەکان خۆیانی پێ‌بڕازێننەوە و لەسەریان بڕۆن

وە سەبارەت بە ڕەوشت و سیفەتەکانی بانگخوازان کە دەبێت ئاوەها بن و لەسەر ئەو ڕەوشت و سیفەتانە بڕۆن ئەوا خوای گەورە لە چەندین ئایەتی زۆردا و لە چەندین شوێنی کتێبە پیرۆزەکەیدا ڕوونی کردوونەتەوە :

**یەکەمینیان** : ئیخلاص و نیەت و نیازپاکی : پێویستە لەسەر بانگخواز کەوا نیەت و نیازپاك بێت بۆ خوای گەورە ، ریا و پێشچاوی و سومعەت و ناوبانگ و ستایش و پیاهەڵدانی خەڵکی مەبەست نەبێت ، هەروەکو چۆن خوای پاك و بێ‌گەرد فەرموویەتی : ﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ ... ﴿١٠٨﴾ ﴾ [يوسف] ، واتە : ئەی پێغەمبەری خوا بڵێ ئەمە ڕێگاکەی منە بانگەواز دەکەم

بۆلای خوا ... ، هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ ... ﴿٣٣﴾﴾ [فصلت] ، واتە : وە کێ هەیە وتە و کاری باشتر بێت لەو کەسەی کە دەعوە و بانگەواز دەکات بۆ لای خوا ...

کەواتە پێویستە لەسەرت کەوا نیەت و نیازت پاك بکەیتەوە بۆ خوای گەورە ، ئەمە گرنگترین ئەخلاق و ڕەوشتە ، ئەمە گەورەترین سیفەتە کەوا تۆ لە دەعوە و بانگەوازکردنەکەتدا مەبەستت ڕەزامەندی و پاداشتی خوا و ماڵی دوارۆژ بێت .

**دووەم** : دەبێت لەسەر بەرچاوڕۆشنی بیت لە دەعوە و بانگەوازکردنەکەتدا واتە دەبێت لەسەر علم و زانست بیت ، نابێت جاهیل و نەزان بیت بەوەی کە دەعوە و بانگەوازی بۆلا دەکەیت ، ﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ ﴿١٠٨﴾﴾ [يوسف] ، واتە : ئەی پێغەمبەری خوا بڵێ ئەمە ڕێگاکەی منە بانگەواز دەکەم بۆلای خوا **لەسەر بەرچاوڕۆشنی** .

علم و زانست پێویستە و بێ ئەمە دەعوە و بانگەواز ناکرێت ، هەبوونی علم و زانست فەرز و پێویستە ، ئامان وریابە لەوەی کە دەعوە و بانگەواز بکەیت لەسەر جەهل و نەزانی ، هەروەها وریابە لەوەی کە قسە لە شتێکدا بکەیت تۆ نایزانیت ، چونکە کەسی جاهیل و نەزان دەڕوخێنێت و بنیاد نانێت ، وە تێك دەدات و چاك ناکات ، بۆیە لەخوابترسە ئەی عەبدی خوا ، ئامان وریابە لەوەی کە بە ناوی خواوە قسە بکەیت بەبێ علم و زانست ، دەعوە و بانگەواز بۆ هیچ شتێك مەکە ئیللا لە پاش هەبوونی علم و زانست بەو شتە و بەرچاوڕۆشنی بەوەی کە خوا و پێغەمبەرەکەی فەرموویانە ، هەبوونی بەرچاوڕۆشنی کە بریتی‌یە لە علم پێویستە .

بۆیە پێویستە لەسەر قوتابی علم و لەسەر کەسی بانگخواز کەوا بەرچاوروون بێت سەبارەت بەوەی کە دەعوە و بانگەوازی بۆلا دەکات ، وە سەیری ئەو شتە و بەڵگەکەشی بکات کە دەعوە

و بانگەوازی بۆلا دەكات ، جا ئەگەر حەقی بۆ دەركەوت و حەقی زانی ئەوا بانگەواز دەكات بۆلای ئەوە چ ئەوە كردەوەكردن بێت یاخود وازلێهێنان بێت ، دەعوە و بانگەواز دەكات بۆ كردەوەكردن ئەگەر تاعەت و گوێڕایەڵی بوو بۆ خوا و پێغەمبەرەكەی ، وە دەعوە و بانگەوازیش دەكات بۆ وازهێنان لەوەی كە خوا و پێغەمبەرەكەی نەهیان لێكردووە و ڕێگری و قەدەغەیان كردووە بە پێی بەڵگە و لەسەر بەرچاوڕوونی و بەرچاوڕۆشنی .

**سێیەم** : هەروەها لەو ئەخلاق و ڕەوشتانەی كە دەبێت لەسەری بیت ئەی كەسی بانگخواز ئەوەیە كە دەبێت تۆ پشوودرێژ و لەسەرخۆ بیت لە دەعوە و بانگەوازكردنەكەتدا ، وە نەرم و نیان و خۆڕاگر و زۆر بە صەبر و ئارام بیت تێیدا ، هەروەكو چۆن پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئاوەهایان كردووە ، ئامان وریابە لە پەلەكردن ، هەروەها وریابە لە ڕەقبوون و

توندوتیژی ، پێویستە بە صەبر و ئارام بێت ، وە پێویستە پشوودرێژ و لەسەرخۆ بێت ، وە پێویستە نەرم و نیان بێت لە دەعوە و بانگەواز كردنەكەتدا ، وە لە پێشەوە هەندێك بەڵگەت بۆ هێنرایەوە لەسەر ئەوە وەكو فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴿١٢٥﴾ ﴾ [النحل] .

واتە : بانگەواز بكە بۆ لای ڕێگای خوا بە دانایی و ئامۆژگاری چاك و گفتوگۆیان لەگەڵدا بكە بەوەی كە چاكترە .

هەروەها فەرمایشتی خوای پاك و بێگەرد : ﴿ فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ ﴿١٥٩﴾ ﴾ [آل عمران] ، واتە : تۆ بە ڕەحمەتێك لە خواوە نەرمیت بۆ نواندن .

هەروەها فەرمایشتی خوای گەورە سەبارەت بە چیرۆك و بەسەرهاتی (موسى) و (هارون) : ﴿ فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ

يَخۡشَىٰ ﴿٤٤﴾ [طه] ، واتە : هەردووکتان وتەیەکی نەرمی پێ بڵێن بەڵکو بیربکاتەوە یان لەخوا بترسێت .

هەروەها لە فەرموودەیەکی صەحیحدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ((اللَّهُمَّ مَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِي شَيْئًا فَشَقَّ عَلَيْهِمْ فَاشْقُقْ عَلَيْهِ ، وَمَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِي شَيْئًا فَرَفَقَ بِهِمْ فَارْفُقْ بِهِ))[١].

واتە : خوایە هەرکەسێك سەرپەرشتی شتێك لە کاروباری ئوممەتەکەمی کرد و لەسەریانی قورس و ناڕەحەت کرد ئەوا تۆیش قورس و ناڕەحەتی بکە لەسەری ، وە هەرکەسێکیش سەرپەرشتی شتێك لە کاروباری ئوممەتەکەمی کرد و نەرم و نیان بوو لەگەڵیان ئەوا تۆیش نەرم و نیان بە لەگەڵی .

بۆیە ئەی عەبدی خوا پێویستە لەسەرت کەوا نەرم و نیان بیت لە دەعوە و بانگەواز کردنەکەتدا و شتەکان لەسەر خەڵك قورس و ناڕەحەت نەکەیت و ڕاویان نەنەیت لە دین و ئاین ، بە وشکی و توندبوونت وە بە جەهل و نەزانیت وە بە ئسلوب و هەڵسوکەوتە

---

[١] صحيح مسلم رقم : (١٨٢٨) .

توونده ئەزێتـدەره زەرەر و زیانگەیەنـەرەکانت ڕاویـان نەنـەیت ، پێویسته لەسەرت کەوا پشوودرێژ و لەسەرخۆ و خۆڕاگر و زۆر بـه صەبر و ئارام بیت ، وه دەبێت ڕاکێشانت ئاسـان و لەسـەرخۆبێت و قسەت نەرم و نیان بێت و وتەکانت شیرین و پاك بێت بۆ ئەوەی کاریگـەری هـەبێت لەسـەر دڵـی براکـەت ، بـۆ ئـەوەی کاریگـەری هەبێت لەسەر دڵی ئەو کەسەی که دەعوه و بانگەوازی دەکەیت ، هەروەها بۆ ئەوەی دڵی بکرێتـەوه بـۆ دەعـوه و بانگەوازەکـەت و دڵی نەرم ببێت بۆی و پـێی کاریگەر ببێت و به هۆیەوه ستایشـی تۆ بکات و سوپاست بکات لەسەری ، بـەڵام توونـدوتیـژی ڕاونـەره نەك نزیك کەرەوه ، وه پەرتەوازەکەره نەك کۆکەرەوه .

هەروەها لەو ڕەوشت و سیفاتانەی که دەبێـت بـەڵکو واجـب و پێویسته کەسی بانگخواز لەسەری بێت و تێیدا هـەبێت : کـردەوه کردنه به دەعوه و بانگەوازەکەی ، وه پێویسته ببێته سەرمەشق و پێشەنگێکی صالح و چاك لەوەدا کـه دەعـوه و بانگـەوازی بـۆلا دەکات ، نەك لەو کەسانه بێت کـه بانگەشـه دەکـات بـۆ شـتێك و

پاشان خۆی وازی لـێدەهێنێت ، وە یان نەهی و ڕێگری لە شتێك دەكات و پاشان خۆی دەیكـات و تێـوەی دەگلێـت ، ئەمـە حـاڵی خەسارۆمەندانە پەنا بە خوا لەوە .

بەڵام ئیمانداره قازانجكار و براوەكان كـه بـانگخوازانی حـەقن ئەوان كردەوە دەكەن بە حەق و گورج وگۆڵ و چالاك دەبن تێیـدا و خێـرادەڕۆن و پەلـەی بـۆلا دەكـەن ، وە دووریـش دەكەونـەوە لەوەی كە لێیان قەدەغەكراوە و نـەهی لــێكراوە ، خـوای گـەورە فـەرمـوویـەتــــــی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٣ ﴾ [الصف] ، واتە : ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە بۆ شتانێك دەڵێن كە كردەوەی پێ ناكەن ٢ ئەوە دەبێتـە مایـەی ڕقێكـی زۆر گـەورە لای خـوا ئەوەی كە دەیڵێن و كردەوەی پێ ناكەن .

هەروەها خوای پاك و بێگەرد هەڵدەكۆڵێت بە جوولەكەكانـدا لەسەر ئەوەی كە فـەرمانیان بـە خـەڵك كـردووە بـە چـاكەكردن و

خۆیانیان لەبیرکردووە و فەرموویەتی : ﴿أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾﴾ [البقرة] ، واتە : ئایا ئێوە فەرمان دەکەن بە خەڵکی بە کردنی چاکە و خۆتانیش لەبیردەکەن و ئێوەیش کتێبەکەی خوا دەخوێننەوە ؟ ئایا ئێوە تێناگەن ؟

وە بە صەحیحی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە کەوا فەرموویەتی : ((يُؤْتَى بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُلْقَى فِي النَّارِ فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُ بَطْنِهِ فَيَدُورُ بِهَا كَمَا يَدُورُ الْحِمَارُ بِالرَّحَى ، فَيَجْتَمِعُ إِلَيْهِ أَهْلُ النَّارِ فَيَقُولُونَ : يَا فُلاَنُ مَا لَكَ أَلَمْ تَكُنْ تَأْمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ ؟ فَيَقُولُ : بَلَى قَدْ كُنْتُ آمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَلاَ آتِيهِ وَأَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ وَآتِيهِ))[١].

واتە : لە ڕۆژی قیامەتدا پیاو دەهێنن و فڕێدەدرێتە ناو ئاگرەوە و ڕیخۆڵەکانی بە خێرایی دێنە دەرەوە و ئەویش بە

[١] صحيح البخاري رقم : (٣٠٩٤) ، وصحيح مسلم رقم : (٩٨٩) .

دەوریــدا دەخولێتــەوە هــەروەكو چــۆن گوێدرێــژ بــە دەوری دەســتهاڕدا دەخولێتــەوە ، ئــەنجا خــەڵكی نــاو ئــاگر لــە دەوری كۆدەبنــەوە و پــێی دەڵــێن : ئــەی فــلان ئــەوە چیتە مەگــەر تــۆ فەرمانت نەدەكرد بە چاكە و نەهی و ڕێگریت دەكرد لە خراپە ؟

ئەویش دەڵێت : بــەڵێ مــن فــەرمانم دەكــرد بــە چــاكە و خــۆم نەمدەكرد ، وە نەهی و ڕێگــریشــم دەكرد لە خراپە و دەمكرد .

ئەمە حاڵی ئەو كەسەیە كە بانگــەوازی كــردووە بــۆلای خــوا و فەرمانی كردووە بە چاكە و نەهی و ڕێگــریشی كردووە لە خراپە و تــاوان ، پاشــان قســەی پێچــەوانەی كــردەوەی بووەتــەوە و كردەوەشی پێچەوانەی قسەی بووەتــەوە ، پــەنادەگرین بــە خــوا لەوە .

كەواتە لە گرنگترین ئەخلاق و ڕەوشتەكان و لە گــەورەترینیان لە ئاست كەسی بانگخوازدا ئەوەیە كەوا كردەوە بكات بەوەی كــە بــانگخوازی بــۆلا دەكــات ، وە وازیشــبێنێت لــەوەی كــەوا نــەهی و ڕێگــری لــێدەكات ، وە دەبێــت خــاوەن ڕەوشــتێكی چــاك و

ژیاننامەیەکی ستایشکراو و بەئارام بوون و خۆڕاگری و ئیخلاص و نیازپاکی لە دەعوە و بانگەوازەکەیدا بێت ، هەروەها دەبێت خاوەن هەوڵ و تێکۆشان بێت لەوەدا کە خێر و چاکەی پێدەگات بە خەڵك و لەوەیشدا کە خەڵك دووردەخاتەوە لە ناحەق و باتڵ ، وە لەگەڵ ئەوەیشدا بۆیان دەپاڕێتەوە و دوعای هیدایەتدانیان بۆ دەکات ، ئەمەیش بەشێکە لە ڕەوشتە چاکەکان کەوا دوعای هیدایەتدان بکەیت بۆ خەڵك و بە کەسی بانگەوازکراو بڵێیت : خوا هیدایەتت بدات ، خوا موەفەقت بکات بۆ وەرگرتن و قەبوڵکردنی حەق ، خوا یارمەتیت بدات بۆ قەبوڵکردنی حەق ، بانگەوازی دەکەیت و ڕێنمایی دەکەیت و صەبر و ئارامیش دەگریت لەسەر ئەزێتەکانی و لەگەڵ ئەوەیشدا بۆی دەپاڕێیتەوە و دوعای هیدایەتدانی بۆ دەکەیت ، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کاتێك کە سەبارەت بە هۆزی (دەوس) پێی وترا : ئەوان سەرپێچیان کردووە ، فەرمووی : ((اللَّهُمَّ اهْدِ دَوْسًا وَائْتِ بِهِمْ))[١].

---

[١] صحيح البخاري رقم : (٩٣٧) ، وصحيح مسلم رقم : (٢٥٢٤) .

واتە : خوایە هیدایەتی دەوس بدە و بیانهێنە بۆ ناو ئیسلام .

دوعای هیدایەتدان و موەفەق بوونی بۆ وەرگرتن و قەبوڵ کردنی حەقی بۆ دەکەیت ، وە صەبر و خۆڕاگریت هەبێت لەسەر ئەوە ، وە بێئوومێد و مەئیوس مەبە لێی و لە قسەی خێر زیاتر هیچ شتێکی تر مەڵێ ، توندوتیژ مەبە و قسەیەکی خراپ مەڵێ کە ڕاونەر بێت لە حەق ، بەڵام کەسێك کە زوڵم و ستەم دەکات و سنوور تێدەپەڕێنێت ئەوا ئەمە حاڵێکی تری هەیە هەروەکو چۆن خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ ﴿٤٦﴾﴾ [العنكبوت] ، واتە : گفتوگۆ و موجادەلە مەکەن لەگەڵ ئەهلی کیتابدا (جوولەکە و گاورەکان) ئیللا بەوە نەبێت کە چاکترە مەگەر تەنها ئەوانەیان نەبێت کە ستەم و زوڵمیان کردووە .

کەسی زاڵم و ستەمکار کە ڕووبەڕووی دەعوە و بانگەواز دەبێتەوە بە شەڕ و خراپە و ملهوڕی و ئەزێتدان ئەمە حوکمێکی

تری هەیە ، دەكرێت تەمێبكرێت لەسەر ئەوە بە سجن‌كردن و حەبس كردنی و جگە لەوەیش ، وە تەمێكردنی لەسەر ئەوە بەپێی پلەكانی زوڵم و ستەمەكەی دەبێت ، بەڵام هەندەی كە خۆی گرتبێتەوە لە ئەزێتدان ئەوا پێویستە صەبر و ئارامی لەسەر بگریت و چاوەڕێی پاداشت بیت لای خوا و بەوەی كە چاكترە گفتوگۆ و موجادەلەی لەگەڵدا بكە ، وە چاوپۆشیش بكە لەوەی كە پەیوەندی بە خودی خۆتەوە هەیە لە هەندێك لە ئەزێتەكانی هەروەكو چۆن پێغەمبەران و شوێنكەوتوانیان بەچاكە صەبر و ئارامیان هەبووە .

وە داوا لە خوای گەورە دەكەم كەوا هەموومان موەفەق بكات بۆ دەعوە و بانگەوازكردن بۆلای بە جوانی ، وە دڵەكانمان و كردەوەكانمانیش چاك بكات ، وە تێگەیشتن لە دین و ئاینەكەی بە هەموومان ببەخشێت و دامەزراویشمان بكات لەسەری ، وە بمانگێڕێت لەو كەسانەی كە هیدایەتدەر و هیدایەتدراون و

بمانیشگێڕێت لە پیاوچاکان و چاکەخوازان ، بەڕاستی خوای گەورە سەخی و بەخشندەیە .

وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّم وَبَارَكَ عَلَى عَبْدِهِ وَرَسُولِهِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ
وَعَلَى آلِهِ وَأَصْحَابِهِ وَأَتْبَاعِهِ بِإِحْسَانٍ إِلَى يَوْمِ الدِّين

سوپاس بۆ خوای گەورە تەواوبووم لە وەرگێڕانی

ئەم کتێبە زۆر بەسوود و گرنگە

لە ڕۆژی چوارشەممە / کاتژمێر : (٤٠ : ١٠)ی پێش نیوەڕۆ

(٥ / ذو الحجة / ١٤٣٧)* بەرامبەر بە (٧ / ٩ / ٢٠١٦)

کوردستان / کەلار / مزگەوتی شێخ إبراهیم

محمد عبد الرحمن لطيف

* **تێبینیەك** : لە

وەك لە پێشەكییەكەدا ئاماژەم پێكردووە دەستمدایە وەرگێڕانی ئەم كتێبە زۆر گرنگە لە بەرواری (٥ / ذو الحجة / ١٤٣٦) ، بەڵام تەواوكردنی وەرگێڕانەكەی یەك ساڵی كامڵی پێچوو ئەویش لەبەر سەرقاڵبوونم بە هەندێك پرۆژەی زانستی ترەوە وەك وەرگێڕانی چەند كتێبێكی تر تاوەكو ئەمڕۆ لە بەرواری (٥ / ذو الحجة / ١٤٣٧)دا كۆتایم پێهێنا و داواكارم خوای گەورە بیكاتە زەخیرەی قەبر و قیامەتم .



## ناوەڕۆك

## الإمام ابن باز في سطور[1]

* هو الإمام الحَبْر المُجدِّد ، شيخ الإسلام ومُفتي الأنام ، العلاَّمة الشيخ عبدالعزيز بن عبد الله بن باز رحمه الله .

* ولد الشيخ في مدينة الرياض بتاريخ : (٢ / ١٢ / ١٣٣٠) هـ .

* كان الشيخ ابن باز إماماً ربانيَّاً حيثُ كان عالماً عاملاً بعلمه ومُعلماً لغيره وداعياً إلى الله على بصيرة ، وكان له حظ وافر من وصفي "الرباني والإمام" المذكورين في قوله تعالى : ﴿ وَلَٰكِن كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمۡ تُعَلِّمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمۡ تَدۡرُسُونَ ٧٩ ﴾ [آل عمران] ، وقوله تعالى : ﴿ وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ٢٤ ﴾ [السجدة] .

* وكان الشيخ ابن باز رحمه الله "**رَجُلَ عامَّةٍ**" وهذه منقبة عند أئمة السلف الصالح كما جاء في كتب التراجم والتاريخ ، وكان "**أُمَّةً في رَجُلٍ**" :

والنَّاسُ أَلْفٌ مِنْهُم كَوَاحِدٍ     وواحِدٌ كالأَلْفِ إِنْ أَمْرٌ عَنَا

* توفي الشيخ بتاريخ (٢٧ / ١ / ١٤٢٠) هـ رحمه الله رحمةً واسعة وأدخله الفردوس الأعلى .

---

[1] اقرأ : (**الشيخ عبدالعزيز ابن باز .. نموذجٌ من الرعيل الأول**) للشيخ عبدالمحسن العبَّاد حفظه الله .
و (**الإمام ابن باز .. دروسٌ ومواقِفٌ وعِبَر**) للشيخ عبدالعزيز السدحان حفظه الله .

* كان وفاة الشيخ ابن باز رحمه الله خسارة كبيرة للعالَم أجمع ومصيبة عظيمة على المسلمين عموماً ، وبوفاة الشيخ تبين للناس مصداق قول بعض أهل العلم قديماً عندما قالوا : (**موتُ العالِمِ موتُ العالَمِ**) .

*** من دُرَرِ كلام الشيخ ابن باز رحمه الله** :

قال الشيخ ابن باز رحمه الله : (**مَنْ نَذَرَ نَفْسَهُ لِخدمة دينهِ عاش مُتعباً ، ولكن سيعيشُ كبيراً ، وسيموتُ كبيراً ، وسيُبعثُ كبيراً ، والحياةُ في سبيل الله أصعبُ من الموتِ في سبيل الله**)

الْحَمْدُ للهِ الذّي وَفَّقَني لِتَرْجَمَةِ هَذَا الْكِتَابِ الصَّغِيْرِ الْحَجْمِ .. الْعَظِيْمِ النَّفْعِ وَالْفَائِدَة :

(**الدَّعْوَةُ إِلَى اللهِ وَأَخلاقُ الدُّعَاة**) لِسَمَاحَةِ الشَّيْخ عَبْدِالعَزِيْزِ بْنِ بَاز رَحِمَهُ اللَّهُ

(لَقَدْ بَدَأْتُ بِتَرْجَمَتِهَا مِنْ مَكَّةَ الْمُكَرَّمَة أَثْنَاءَ مَوْسِمِ حَجِّ عَامِ ١٤٣٦ مِنَ الْهِجْرَةِ النَّبَوِيَّة ،

وانْتَهَيْتُ مِنْهَا فِي بَلْدَتِي كَلار عَامَ ١٤٣٧ مِنَ الْهِجْرَةِ النَّبَوِيَّة)

وَقَبْلَهُ وَفَّقَنِي اللهُ لِتَرْجَمَةِ كِتَابِ :

(**عَقِيْدَةُ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ فِي الصَّحَابَةِ الْكِرَام ﷺ وَأَرْضَاهُمْ**)

لِفَضِيلَةِ الشَّيْخ عَبْدِالمُحْسِنِ بْنِ حَمَد العَبَّادِ البَدْر حَفِظَهُ اللَّهُ

وَقَبْلَهُ وَفَّقَنِي اللهُ لِتَرْجَمَةِ كِتَابِ : **(الْإِسلامُ مِنْهَاجُ الْحَيَاة)**

لِسَمَاحَةِ الشَّيْخ عَبْدِالعَزِيْزِ آلِ الشَّيْخ حَفِظَهُ اللَّهُ

أَثْنَاءَ مَوْسِمِ عُمْرَةِ رَبِيْعِ عَامِ ١٤٣٦ مِنَ الْهِجْرَةِ النَّبَوِيَّة

وَقَبْلَهُ أَيْضَاً وَفَّقَنِي اللهُ لِتَرْجَمَةِ رِسَالَةِ : **(زَادُ الدَّاعِيَةِ إِلَى اللهِ عَزَّ و!جَلَّ)**

لِفَضِلَةِ الإِمَام الشَّيْخ مُحَمَّد بْنِ صَالِح الْعُثَيْمِيْن رَحِمَهُ اللَّهُ

أَثْنَاءَ مَوْسِمِ عُمْرَةِ رَبِيْعِ عَامِ ١٤٣٥ مِنَ الْهِجْرَةِ النَّبَوِيَّة

وَقَبْلَهَا أَيْضَاً وَفَّقَنِي اللهُ لِتَرْجَمَةِ كِتَابِ : **(تَفْسِيْرُ سُوْرَةِ الْفَاتِحَة)**

لِمَعَالِي الشَّيْخ صَالِح بْنِ فُوزَان الفُوزَان حَفِظَهُ اللَّهُ

أَثْنَاءَ مَوْسِمِ عُمْرَةِ رَبِيْعِ عَامِ ١٤٣٤ مِنَ الْهِجْرَةِ النَّبَوِيَّة

وَقَبْلَهُ أَيْضَاً وَفَّقَنِي اللهُ لِتَرْجَمَةِ كِتَابِ : **(الدُّرُوسُ الْمُهِمَّةُ لِعَامَّةِ الأُمَّة)**

لِسَمَاحَةِ الشَّيْخ عَبْدِالعَزِيْزِ بْنِ بَاز رَحِمَهُ اللَّهُ

أَثْنَاءَ مَوْسِمِ حَجِّ عَامِ ١٤٣٣ مِنَ الْهِجْرَةِ النَّبَوِيَّة

اللَّهُمَّ ارْزُقْنِي ا□تْيَانَ إِلَى الْحَجِّ وَالْعُمَرَةَ مَرَّاتٍ عَدِيْدَة

وَارْزُقْنِي الإِقَامَةَ فِي مَكَّةَ الْمُكَرَّمَة وَالْمَدِيْنَةِ النَّبَوِيَّة